# گوێ بگرە پیاوی بچووك

ولیام ڕایش







وەرگێڕانی:
مامۆستا دیار عەزیز
جوتیار قارەمان

# گوێ بگرە، پیاوی بچووک!

## ڤیلهێلم ڕایش

وەرگێڕانی:

دیار ئەسعەد عەزیز    جووتیار قارەمان

| |
| --- |
| ناوی کتێب: گوێ بگرە، پیاوی بچووک! |
| نوسینی: ڤیلهێلم رایش. |
| وەرگێرانی: دیار ئەسعەد عەزیز و جووتیار قارەمان. |
| پێداچوونەوەی: سەردار حەسەنخالی. |
| دیزاین: کۆمپانیای کتێب. |
| نۆبەتی چاپ: چاپی یەکەم. |
| تیراژ: 2000 دانەی لێ چاپکراوە. |

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی سپاردنی (1841) ساڵی (2017) پێدراوە.




**لەم وەرگێڕانە ئینگلیزییەوە کراوە بە کوردی:**

Listen, Little Man!
Wilhelm Reich
Translated by: Teodore P. Wolfe
With illustrations by: William Steig
Published in Pelican Books 1979

بـــە وەرگێـــڕدراوە ئینگلیزییەکـــە و. هەروەها بـــەم وەرگێڕدراوە عەرەبییـــەی بـــەراورد کردراوەتەوە:

خطاب الى الرجل الصغير
فيلهلم رايش
ترجمة: رشيد بوطيب
منشورات الجمل
طبعة الأولى. كولونيا – ألمانيا ٢٠٠٢



((پێشکەشە بە باوکم کە یەکێک
بووە لە پیاوە مەزنەکان.))

“ئەوین، زانیاری و کار کانیاوەکانی
ژیانمانن. بە دڵنیاییەوە دەبێت
ئاڕاستەیشی بکەن.”

ڤیلهێلم ڕایش



"هۆ دووڕووە کۆنەپەرستەکان، ئەوانەی پێم ڕادەبوێرن!

لەو ڕۆژەوەی دەستتان بەسەر دنیادا گرتووە،

سیاسەتەکەتان لەسەر چی دەژی؟

لەسەر بەرتیل و پیاوکوژی!"

*بۆ ئولێنشپیگێل، چارلێس دی کۆستەر*



# ژياننامەی ڤيلهێلم ڕايش

ڤيلهێلم ڕايش لە ساڵی 1897ز. لە گاليسيا لە دايک بووە، لە ساڵی 1918ز. لە زانکۆی ڤيەننا بەشی دەرمانسازيی خوێندووە، ساڵی 1920ز. لە کاتێکدا کە ڕايش هێشتا خوێندکاری زانکۆ بوو، وەک ئەندام لە "کۆڕی دەروونشيکاری"دا وەرگيرا کە سيگمۆند فرۆيد سەرۆکايەتيی دەکرد. جا تا ساڵی 1934ز. هاوکارێکی نزيکی فرۆيد و دەروونشيکارەکان بووە. لە ساڵی 1930ز. نەمسای جێ هێشتووە و چووەتە بەرلين، لەوێ چالاکانە لە بواری دەروونديروستيدا کاری کردووە و لە "کلينکی

دەروونشـــیکاری" و "کۆلێژی کرێکارانی مارکســـی" وانەی وتووەتەوە. کـــە هیتلەر دەســـەڵات دەگرێتە دەســـت، ناچار بـــووە ئەڵمانیا جـــێ بهێڵێـــت و وەکوو پەنابـــەر بۆ ماوەی شـــەش ســـاڵ لە دانیمارک و ســـوید و، دواجار لـــە نەرویج کار بکات. لە ســـاڵی 1939ز. ئەورووپای جێ هێشت و ڕووی کـــردە ویلایەتـــە یەکگرتووەکانی ئەمریکا. لـــەوێ تاقیگەیەکی لێکۆڵینەوەی لە "فۆرِســـت هیڵ"ی ویلایەتـــی نیۆرک و دواتر لـــە "مەیـــت" دامەزراند، کە لـــە ســـاڵی 1947ز. دەبێت بە بابەتـــی توێژینەوە لەلایـــەن "بەڕێوەبەرایەتیـــی خۆراک و دەرمان"ـــەوە، جا بـــە هـــۆی توێژینەوەکانیەوە، لە ســـاڵی 1954ز. لەلایەن دەســـەڵاتی دادوەرییەوە ســـکاڵایەکی لە دژ بەرزکرایـــەوە، لـــێ ڕایش ئـــەوەی ڕەد کردەوە کـــە بە زۆر وەک "تۆمەتبار" لەســـەر کێشـــەی لێکۆڵینەوەی "وزەی ژیان" ڕووبـــەڕووی دادگا بکرێتـــەوە. دوابەدوای ئـــەوە، بە تاوانی ســـووکایەتیکردن و گوێڕایەڵینەکردنـــی فەرمانەکە، تۆمەتبار کـــرا و بە زیندانیکـــردن بۆ ماوەی دوو ســـاڵ ســـزا درا. ڕایش لە بەندیخانەی چاکســـازیی فیدراڵـــی و لە ڕێککەوتی 3ی نۆڤەمبـــەری 1957ز.دا کۆچـــی دوایی کرد.

## بەرایی:

**خوشک و برای ستەمدیدەی کوردزمانم، سڵاوی ئازادی لە تۆ!**

ئەم کتێبەی لە بەردەستتدایە، بە بچووکییەکەیدا تێنەکەویت و بخڵەتێیت. دەتوانم بڵێم یەکێکە لەو کتێبە گەورە و بەهێز و پێزانەی کە مرۆڤایەتی بە خۆیەوە بینیویەتی؛ پەیامێکی جیهانیانەی بۆ مرۆڤایەتی تیایە. مرۆڤ لە کۆیلایەتیی مرۆڤگەلی زل و بۆشەوە بۆ ئازاییی ڕاستەقینە بانگ دەکات و هان دەدات. جا وریابە بە ئاسانی بەسەریدا تێنەپەڕیت. دڵ و مێشکی خۆتی بۆ بکەوە و بە چاوێکی بینا و، هزرێکی پاک و سافەوە بیخوێنەوە. لە دێڕ بە دێڕی بتۆژەوە و ڕابمێنە. تا دەتوانی ڕستەکانی لێک بدەوە و ورد بکەوە؛ تا کەڵک و بەهرەی لێ ببەیت—دڵنیایشم هەر وا دەبێت—.

ئێمەی کوردی ژێرچەپۆکەی دوژمنی خۆیی و بێگانە، زیاتر لە مرۆی هەر گەل و نەتەوەیەکی تر سووک و چرووک و بچووک کراوین. گا بە جەستە گا بە بیرمان بە کۆیلە و نۆکەر کراوین. هەر لە بەرایی مێژووەوە، لەو دەمەوەی چاومان هەڵهێناوە، پەتپەتی دنیامان دیوە. ئەوەی

بەســـەر ئێمەدا هاتووە، مەگـــەر بارەش بە ڕەشـــماڵە کۆنەی جافـــی هەردەگـــەڕی ئەم نیشـــتمانەی کردبێت. بە دەســـتی کێ؟ بە دەســـتی دەر و دراوســـێ، دۆســـت و دوژمن، بێگانە و خوێش. هەســـتی خۆبەکەمزانیـــن و بچووکبینین لەبەرانبەر ئەوانـــەی وا بە دەســـتی خۆمان زل و گەورەمـــان کردوون و بۆ تەشـــقی ئاســـمانمان بردوون، وەکوو ڕەگی ســـپییەبیی ســـەر کانیاوی لاتیپەکانی کوردســـتان بە ئاخماندا داچەقیوە: مینـــا پەتایەکی پیس و کـــوژەر، هەموو مێشـــکمانی تەنیوە: جا بزانـــە هێزی فرە و بـــازووی گەورە و پیـــاوی مەیدانی دەوێـــت تا لەبنـــدا دەریهێنرێت و دوایی پـــێ بهێنرێت. دەی لێـــت ڕوون بێت کە نووســـەری ئەم کتێبە یەکێکـــە لەو بەهێز و بازووگەورانـــەی قۆڵی پیاوەتـــی هەڵماڵیوە و بۆی هاتووەتە گۆڕەپانی ململانێ و باشـــیش دەرۆســـتی هاتـــووە و، نەک هەر پشـــتی لـــە عـــەرد داوە، بەڵکوو زۆر چـــاک تێلاترێنی کردووە و تـــاری ناوە.

هاوزمانی خۆشەویســـتم! من لام وایە پێویســـت دەکات ئەم کتێبە لـــە هەموو ماڵ و ناوەند و ڕێکخـــراو و دامودەزگایەکی کوردیـــدا هەبێت و لێـــی بخوێنرێت، تا ڕۆڵـــەی کورد چاو و مێشـــکی بکرێنەوە و، لە ئاســـت هیچ دەســـبڕ و دەسپڕ و

ورنگپەرسـت و گەڵپەرسـتێکی نێوخۆیی و دەرەکیدا نەوی نەبـن؛ ڕاسـاڵ و زیت و نلێر و سـڵ و زاڵ بن.

پێویسـتە ئەوە بزانـن کاتێک نووسـەر دەڵێت: "پیاو." هەر مەبەسـتی "پیـاو" نییـە. بەڵکوو مرۆڤی مەبەسـتە— ڕووی دەمی لـە ژن و پیاوە.

**هیوام وایە ئەم کتێبە بۆتان ببێتە ئامیانی ئاز و ئازا و ئازاد ژیان.**

جووتیار کارەمان

۲۰۱۸/۰۷/۱۸ — چوار شەمە



باوکەڕۆ!

ئۆی خودایە



## پێشەکی:

پەرتووکی «گوێ بگرە، پیاوی بچووک!» بەڵگەنامەیەکی مرۆییە، نەک زانستی. لە هاوینی ساڵی 1945 بە مەبەستی ئەرشیفکردن بۆ پەیمانگای ئۆرگۆن نوسراوەتەوە، بەبێ ئەوەی نیاز لە بڵاوکردنەوەی هەبووبێت. ئەم پەرتووکە ئاکامی ئەو هەژان و ململانێ ناوەکییانەیە کە چەندین دەیەیە زانا و پزیشکێک بینونی، سەرەتا ساویلکانە، دواتر بە سەرسوڕمانەوە و دواجاریش بە ترسەوە، کە پیاوی بچوک لەسەر شەقامدا چی بە خۆی دەکات؛ چۆن ئازار دەچێژێت و یاخی دەبێت، چۆن ڕێز لە دوژمنەکانی دەگرێ و هاوڕێکانی

دەکوژێـــت؛ چۆن هەرکـــە وەک "نوێنەری خەڵکی" دەســـەڵاتی دەکەوێتە دەســـت. ئەو دەســـەڵاتە بە خراپ بـــە کاردەهێنێت و دەیکات بە شـــتێکی خـــراپ و توندوتیژتر لەو دەســـەڵاتەی کە پێشـــتر بەدەســـتییەوە نالاندوویەتی، کاتێک بە دەســـت تاکە سادیگەرەکانی چینەکانی ســـەرەوە بووە.

ئـــەم "وتە"یـــە بـــۆ پیاوی بچـــوک، وەڵامێکـــی بێدەنگ بوو بۆ قســـەڵۆک و ناوزڕانـــدن. ئەوە دەمەی نووســـرا، هیچ کەس نەیدەتوانی پێشـــبینیی ئـــەوە بکات کـــە دامەزراوەیەکی حوکوومیی بەرپرســـیار لە ســـاغلەمیی کۆمەڵگا، بـــە هاوکاریی سیاســـەتمەدار و دەروونشـــیکارە پلەویســـتەکان، هێرش بکەنە ســـەر زیندە وزەی ژیان. چەند دەیەیە، چەندین جار کۆشـــاون لەڕێی دەرکی هەســـتەکانەوە، توێژینـــەوەی ئۆرگۆن(زیندەوزەی ژیـــان) لەناو ببەن(جوان ســـەرنج بدە: نەک ئەوەی بیســـەلمێنن کە هەڵەیە، بەڵکـــو بەناوزڕاندن لەنـــاوی ببەن.)

توێژینـــەوەی ئۆرگۆن بەرپرســـیارێتیەکی گـــەورەی ژیانی مرۆڤ و تەندروســـتی لە ئەســـتۆ دەگرێت. ئەم ڕاستیە پاساوی بڵاوکردنـــەوەی ئەم "وتە"یەیە وەکـــوو بەڵگەنامەیەکی مێژوویی. گرنگە بـــۆ "مرۆڤـــی ئاســـایی" بزانێت چی لە ژورک شـــۆپە زانســـتینەکان دەگوزەرێ و هەروەها فێری ئـــەوە ببێت کە چۆن لە چاوی پزیشـــکێکی دەروونناســـەوە دەبینرێـــت. دەبێت فێری ئەوە ببێـــت کە تەنیا لـــە ڕێی زانینـــی هەقیقەتـــەوە دەتوانێ

حەز و ئارەزووی بۆ بەدەســـتهێنانی دەســـەڵات پوچەڵ بکاتەوە. دەبێـــت روون و رەوان پێی بوترێت کە چ بەرپرســـیاریەتیەکی لە ئەســـتۆدایە، چ کاربکات، خۆشەویســـتی بـــکات، ببوغزێنێت یان قســـەڵۆک بکات. پێویســـتە بزانێت کە چـــۆن دەگۆڕدرێت بۆ فاشیســـتێکی رەش یان ســـوور. ئەوەی کە بۆ پاراســـتنی ژیـــان و پارێزگاریکردن لـــە منداڵەکانی دەجەنگێت، پێویســـتە دژی فاشیســـتە ســـوور و رەشـــەکان بێت. نەک لەبەر ئەوەی ئەمڕۆ فاشیســـە ســـوورەکان وەک فاشیسە رەشـــەکانی پێشتر خاوەنی ئایدۆلۆژیای کوشـــندەن، بەڵکو لەبـــەر ئەوەی منداڵانی تەندروســـت و زینـــدوو دەکـــەن بـــە منداڵانـــی پەککەوتە و رۆبۆتناســـا و رەوشـــت دەبەنگ؛ چونکە لەگەڵ ئـــەودا، "وڵات" لەســـەروو "ماف"ەوەیـــە، "درۆ" لە پێش "راســـتی" و "جەنگ" لـــە پێش "ژیـــان"ەوە یـــە؛ لەبەر ئـــەوە منداڵان و پاراســـتنی ژیانی منـــداڵان، وەک تاکە هیوامان دەمێنێتەوە. مامۆســـتایان و پزیشـــکان تاکە ئەرکێکیان لەســـەر شـــانە کە دەبێت بەرانبەری دڵســـۆز بن. ئەویـــش: هێزی ژیان لـــە منداڵ و نەخۆشـــدا. ئەگەر لەســـەر ئـــەم ئەرکە ســـوور و بەئەمەک بن، ئـــەوا ئەو گرفتـــە مەزنانەی بە "سیاســـەتی دەرەکی"یەوە پەیوەســـتن، بە ئاســـانی چارەســـەریان بۆ دەدۆزێتەوە.

نابێـــت ئـــەم "وتە"یە وەکـــوو نموونەی بـــاڵای ژیان لێی بڕوانرێـــت. وەســـفی ئـــەو تەوژمانـــە دەکات کـــە ژیانی پڕ

هەســـت و ســـۆزی کەســـێکی بەبەرهەم و دڵخۆشـــدا هەیە. بۆ ئەوە نەنوســـراوە خەڵکی قایـــل بکات یان لایەنگر بەدەســـت بهێنێـــت. ئەم نوســـراوە وێنـــەی ئەزموونەکانی ژیـــان وەکوو تابلـــۆی زریانێکی هەورەبروســـکاوی پیشـــان دەدات. داوا لە خوێنـــەر ناکرێـــت تاکو بە دڵی بێـــت. لەوانەیـــە بیخوێنیتەوە یـــان نەیخوێنیتـــەوە. هیچ نیاز یـــان پرۆگرامێکـــی تێدا نیە. تەنیـــا دەیەوێـــت کاردانەوەی کەســـی بـــۆ مافـــی لێکۆڵەر و بیرمەندەکان بەدەســـت بهێنێت کە بۆ شـــاعیر و فەیلەسوفەکان نکۆڵیلێنەکـــراوە. ئـــەم نوســـراوە نارەزاییـــە لـــە دژی نیازە نهێنـــی و نەناســـراوەکانی دەوری هەســـت و ســـۆزەکان کە تیـــری ژەهراوی خـــۆی لە بۆســـەیەکی ســـەلامەتەوە دەگرێتە لێکۆڵـــەرە مانـــدووەکان. ئەم نوســـراوە ئـــەوە دەردەخات کە دەدرە هەســـت و ســـۆزداریەکان چیـــن، کردارەکانـــی چین و چـــۆن بەرەوپێشـــچوونەکان دوادەخەن. هەروەها شـــایەتییە بۆ متمانەبوون بـــەو گەنجینە مەزنـــە لەبیرکراوەکـــەی لە قوڵاییی "سروشـــتی مرۆیی"دا ڕۆنراوە و، ئامادەیە هیـــوا و ئاواتەکانی مرۆڤ بـــەدی بهێنێت.

تاکـــی زیندوو لـــە پەیوەندییە مرۆیـــی و کۆمەڵایەتیەکاندا داویلکە و دۆستانەیە، بەم شـــێوەیە لە ژێر هەلومەرجە باوەکاندا دەخرێتە مەترســـیەوە. وا دادەنێت کە هاومرۆڤەکانی دیکەیشـــی شـــوێن یاســـاکانی ژیان دەکەون و، بەســـۆز و یارمەتیدەر و

بەخشــــندەن. هەتا ئەم دەردە هەستەکی و ســـۆزییە هەبێت، ئەم هەڵوێســـتە ناخییە سروشـــتییەی کە لە منداڵانی تەندروســـت و کەســـانی ســـەرەتاییدا هەیە، لــە ململانێـــی بەناوەزیکردنی بڕیارەکانـــی ژیاندا دەبێت بـــە گەورەترین مەترســـی. چونکە تاکی دەردەدار تایبەتمەندێتییەکانی بیرکردنەوە و هەڵســـوکەوتی خـــۆی دەداتـــە پـــاڵ هاومرۆڤەکانی تـــری. تاکـــی میهرەبان بـــڕوای وایە کە هەمـــوو خەڵکی میهرەبانن و بەو شـــێوەیەیش هەڵســـوکەوت دەکەن. تاکی دەردەدار و خراپیـــش بڕوای وایە هەموو خەڵکی درۆ، فێڵ و دزی دەکەن و پەرۆشـــی بەدەستهێنانی هێز و دەســـەڵاتن. ئاشـــکرایە کە لـــە دۆخێکـــی وادا ژیان لە زیـــان و لـــە مەترســـیدایە. لە هەر شـــوێنێک تاکـــە دەردەدار هەبێت، ژیـــان زەوت و بێبایەخ دەکرێـــت و ناپاکیی لێ دەکرێت و؛ لـــە هەر شـــوێنێک متمانە بـــەو دەردەدارە بکرێـــت، گزی لە ژیان دەکرێت.

تا ئێســـتاکە هەر وا بووە. ئێســـتایش کاتـــی هاتووە ژیان تونـــد و ڕەق بێت، لـــە کاتێکدا کە توندی لە ململانێی پاراســـتن و بەرەوپێشـــچوونیدا پێویســـتە؛ کە ئەمەیـــش بکرێت، ئەگەر ئازایانە بـــە هەقیقەتەوە پەیوەســـت بێت، ئەوا ژیـــان بەزەیی خۆی لەدەســـت نادات. لەنێو ئەو ڕاســـتیەی کـــە لەنێو ملیۆنان مرۆڤـــی کارکـــەر و تاکی بەڕێـــزدا هەمیشـــە کەمینەیەک تاکی زیانبەخـــش و پیاوکوژ هەن کـــە دەبنە هۆی زیانی کوشـــندە

لە ڕێگـــەی بانگکـــردن و سەرنجڕاکێشـــانیان و بەکارهێنانی هێزە تاریک و ترســـناکەکانیانەوە دژی پێکهاتەی مرۆیی مرۆڤی ئاســـایی و، ڕێکخســـتنیان دەسانقەس بۆ کوشـــتاری سیاسی، هیوایـــەک هەر هەیە. تەنیا یەک چارەســـەر هەیە بۆ پاراســـتنی تاکەکان لە توشـــبوون بە دەردە هەست و ســـۆزییەکان، ئەویش: هەســـتکردن بەوەی لە ژیاندا زیندووە. ژیان داوای دەســـەڵاتت لێ نـــاکات، بەڵکـــو داوای ڕۆڵێکی تەواو و گرنگـــت لێ دەکات بۆ ژیانـــی مرۆڤەکان، ئەویش لەســـەر ســـێ کۆڵەکـــە بەندە: خۆشەویســـتی ، کار، زانیاری.

هەرکەســـێک بیەوێت ژیان لە تووشـــبوون بە دەردە هەست و ســـۆزییەکان بپارێزێـــت، دەبێت فێر ببێت ئـــەو مافی ئازادیی دەربڕینـــە بـــەکار بهێنێـــت، وەک ئـــەوەی ئێمە لـــە ئەمێریکا چێـــژی لێدەبینیـــن و، لە پێناو باشـــەدا بـــەکاری بهێنێت، یان بـــە لایەنی کەمەوە وەک ئەوەی دەردە هەســـت و ســـۆزییەکان بۆ کاری خـــراپ کەڵکی لـــێ وەردەگرێت. بێگومـــان ئەگەر بە یەکســـانی مافی ئازادیـــی دەربڕینی بیرورا هەبێـــت، لە کۆتایدا ژێـــری دەبیاتەوە. ئەمەیـــش ئاواتێکی گرنگە.



تۆ "پیاوێکی بچووک و باویت."

# گوێ بگرە، پیاوی بچووک!

پێت دەڵێن: "پیاوی بچووک"، "پیاوی باو؛" دەڵێن چەرخێکی نوێ دەستی پێکردووە: "چەرخی پیاوە باوەکان." ئەوە تۆ نیت کە وا دەڵێیت، هۆ پیاوی بچووک. جێگری سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان، ڕێبەرانی کرێکاران، کوڕە پەشیمانەکانی ماڵباتە[1] بورژواکان، پیاوانی دەوڵەت و فەیلەسووفەکان، ئەمانەن کە وا دەڵێن. ئەوان داهاتووت پێ دەبەخشن، بەڵام لە ڕابردووت ناپرسنەوە.

تۆ میراتگری ڕابردوویەکی تۆقێنەر، کەلەپوورەکەت ئەڵماسێکی سووتاوە لەنێو مشتدا. ئەمەیان من پێتی دەڵێم.

هەموو پزیشک و پینەدۆز و میکانیکی و مامۆستایەک پێویستە خەوشی کارەکەیان بزانن، ئەگەر دەیانەوێت کارەکەیان ئەنجام بدەن و بژێوی ژیانیان دابین بکەن. بۆ چەند دەیەیەک لەسەر ئەم زەمینە ڕۆڵی خۆت بەڕێوە دەبەیت. داهاتووی مرۆڤایەتی بە بیرکردنەوە و کردارەکانتەوە پەیوەستە. بەڵام مامۆستا و گەورەکانت

---

[1] ماڵبات: خێزان، بنەماڵە

پێت ناڵێن لە ڕاستیدا تۆ چیت و چۆن بیر دەکەیتەوە؛ هیچ کەس ناوێرێت یەک ڕەخنەیشت لێ بگرێت، کە ئەم ڕەخنەیە توانایەکی وات پێ دەبەخشێت بتوانیت ببیت بە سەرداری چارەووسی خۆت. تۆ تەنیا لە یەک مانادا "ئازادیت": ئازادیت لە بەڕێوەبردن و پەروەردەی ژیانی خودی خۆتدا، ئازادیت لە ڕەخنە لەخۆگرتندا.

من هەرگیز لە تۆم نەبیستووە سکالا بکەیت: "ئێوە هانم دەدەن تا گەورە و سەروەری داهاتوو و دونیای خۆم بم، لێ ئەوەم پێ ناڵێن چۆن کەسێک دەبێت بە سەردار و گەورەی خۆی و، هەڵەی بیرکردنەوە و کردارەکانمم پێ ناڵێن."

تۆ ڕێگە بە پیاوانی دەسەڵات دەدەیت وا پیشان بدەن کە هێز و دەسەڵاتیان داوەتە دەست "پیاوی بچووک،" بەڵام خودی خۆت بە بێدەنگی دەمێنیتەوە. تۆ هێز دەدەیت بە کەسانی زۆردار و ناپیاو کە نیازی شەیتانانەیان هەیە تا نوێنەرایەتیی تۆ بکەن. فرە درەنگ درک بەوە دەکەیت کە هەمدیسان و جارێکی دیکەیش خاپێنراویت[1].

لێت تێدەگەم، هەزاران جار تۆم بە ڕووتوقووتی، هەم جەستە و هەم ڕووحیشتم بینیوە، بەبێ دەمامک، بەبێ

---

[1] خاپاندن: فریودان، هەڵخەڵەتاندن (خاپێنراو: فریودراو، هەڵخەڵەتێنراو)

کارتی دەنگدان، بەبێ پشتگیری و خۆشەویستیی خەڵک، ڕووت وەکوو منداڵی تازە لەدایکبوو، ڕووت وەکوو سوپاساڵارێک بە دەرپێکورتێکەوە. تۆ لەبەردەم مندا ساکاڵات کردووە و گریاویت، باسی ئارەزووەکانت بۆ کردووم، خەم و خۆشەویستیی خۆتت بۆ باسکردووم. دەتناسم و لێت تێدەگەم. دەمەوێت پێت بڵێم کە تۆ چۆنیت، پیاوی بچووک، بە ڕاستی بڕوام بە داهاتووە مەزنەکەت هەیە. هیچ گومانێکی تێدا نییە کە داهاتووی تۆیە. بۆیە سەرەتا تەماشایەکی خۆت بکە. بەو جۆرەی کە هەیت خۆت ببینە. گوێ بگرە لەوەی کە سەرکردەکان و نوێنەرەکانت ناوێرن پێت بڵێن: "تۆ 'پیاوێکی بچووک و باویت.' لە مانای هەردوو وشەی "بچووک" و "باو" تێبگە.



تۆ "پیاوێکی بچووک و باویت."

ڕامەکە. بوێری ئەوەت هەبێت تەماشای خۆت بکەیت!

"بە چ مافێکەوە ئەو شتانە بە من دەڵێیت؟" من ئەم پرسیارە لە ڕووخساری نیگەرانتدا بەدی دەکەم. هۆ پیاوە بچووکەکە، ئەم پرسیارە لە دەمە پیسەکەتەوە دەبیستم. تۆ دەترسیت لەوەی تەماشای خۆت بکەیت. هەی گزگل[1]، لە ڕەخنە دەترسیت، هەروەک چۆن لەو دەسەڵاتە دەترسیت کە پەیمان دراوە پێت بدرێت. تۆ نازانیت چۆن ئەو دەسەڵاتە بەکار بهێنیت. تۆ ناوێریت بیر لەوە بکەیتەوە لەوانەیە بتوانیت جیاوازتر بیت لەوەی کە هەیت: ئازاد لەبری ترسنۆک، کراوە لەبری تەڵەکەباز، لە ڕۆژی ڕووندا بە ئاشکرا خۆشەویستی بکەیت، نەک وەک دز لە تاریکە شەودا. ئاخر هەی پیاوی بچووک، تۆ خۆت بەکەم دەبینیت. بە خۆت دەڵێیت: "من کێم تا بیر و بۆچوونی تایبەت بە خۆمم هەبێت و، ژیانی خۆم دیاری بکەم و بە خەڵکی بڵێم ئەم دونیایە هی منە؟" ڕاست دەکەیت، تۆ کێیت تا بانگەشەی ژیانی خۆت بکەیت؟ من پێت دەڵێم کە تۆ کێیت:

تۆ تەنیا لە یەک شتدا لە پیاوی مەزن جیاوازیت: پیاوی مەزن سەردەمانێک وەکوو تۆ زۆر بچووک بووە، بەڵام پەرەی بە توانایەکی گرنگی خۆی داوە: فێر بووە کە کەی لە بیرکردنەوە و ڕەفتاریدا بچووک بووە، دەستنیشانی

---

[1] گزگل: گرگن، کورتەبنە

کـردوون. لەژێـر پەسـتانی چەنـد گیروگرفتێکـدا باشـتر و باشتر فێری ئەوە بوو هەست بە مەترسیی بچووکبوون و خـۆبەکەمزانینی بکـات. بەشـێوەیەکی تـر، پیـاوی مەزن دەزانێت کەی و لە چیدا پیاوێکی بچووکە. کەچی پیاوی بچووک درک بەوە ناکات کە پیاوێکی بچووکە و، لەوەیش دەترسێت پێی بزانێت. بچووکی و هیچوپووچیی خۆی بە ساوێری[1] هێز و دەسەڵات دادەپۆشێت، هێز و دەسەڵاتی کەسـانی تـر. شـانازی بە گەورەکـانیەوە دەکـات لەبـری ئەوەی شـانازی بەخـۆیەوە بکـات. ئەو بیـرۆکەیەی لا پەسەند و بەجێیە کە هی خۆی نییە، جیایە لەوەی خۆی هەیەتـی. بەشـێوەیەکی تەواو بـڕوای بەو شـتانە هەیە کە کەمتـر لێیـان تێـدەگات و، بـاوەڕی بەو بیرۆکـانە نیـیە کە زۆر بە ئاسانی لێیان تێدەگات.

دەبێـت مـن لە پیـاوە بچـووکەکەی نـاخی خـۆمەوە دەست پێبکەم:

بیست و پێنج ساڵە، بە نووسین و قسەکردن، لایەنگر و بەرگریکـاری تـۆ بـووم بـۆ بەختەوەربوونـت لەم دونیـایەدا. تۆمەتبـارم کردوویـت بەوەی کە بێتوانایـت لە دەسـتگرتن بەسـەر ئەو شـتانەی کە هیـی تـۆ بـوون، تۆمەتبـارم کردوویت بەوەی نەتتوانیـوە ئەو دەسـتکەوتانە بپارێزیـت کە لە شـەڕی خوێنـاویی پـاریس و ڤییەننـا و

---

[1] ساوێر: وەهم

ڕزگـارکردنی ئەمەریکـا، یـان لە شۆڕشـی ڕووسـییەکاندا بەدەسـتت هێنـابوون. پاریسـت بە پێتـاین و لاڤاڵ، ڤیەننـات بە هیتلەر، ڕووسیات بە ستالین و، پێدەچێت ئەمێریکایشـت بە ڕژێمێکـی کوکلـوکس کـلان کۆتـایی بێـت. تـۆ لەجیـاتی ئەوەی بەرگـری لە مـانەوەی ئـازادیی خـۆت و کەسـانی تـریش بکەیـت، بـاش دەزانیـت کە چـۆن ئـازادیی خـۆت بەدەسـت بهێنیـت. لەمێـژە ئەوە دەزانـم. ئەوەی تێینـاگەم ئەوەیە بۆچی هەموو جارێک کۆڵنەدەرانە جەنگاویت تا لە داماوییەک ڕزگارت ببێت، کەچی کەوتوویتەتە نـاو دامـاوی و کڵۆڵییەکی خراپترەوە؟ دواتر، بە هێواشـی و لەسـەرخۆ، ئەوەم دۆزیـیەوە کە چـی تـۆی کـردووە بە کـۆیلە: خـۆت هۆکاری کۆیلەبوونی خۆتیت. هیچ کەسی تر نـا— جگە لە خودی خۆت کەسی تر بەرپرسیاری کۆیلایەتیی تۆ نییە.

ئەمە شتێکی نـوێیە بۆ تۆ، ئەی وانییە؟ ڕزگارکەرانت پێـت دەڵـێن: "چەوسـێنەرەوەکانت بـریتین لە: ڤیلهـێلم و نیکـۆلاس و پاپـا گریگـۆریی بیستوهەشـتەم و مۆرگـان و کروپ و فۆرد و ڕزگارکەرانیشت بریتین لە: مۆسـۆلینی و ناپلیۆن و هیتلەر و ستالین."



خۆت هۆکاری کۆیلەبوونی خۆتیت

منیش پێت دەڵێم: "تەنیا خودی خۆت دەتوانیت ببیتە ڕزگارکەری خۆت!"

ئەم ڕستەیە نیگەرانم دەکات. من خۆم بە خەباتکەر دەزانم لە پێناو پاکێتی و حەقیقەتدا. ئێستایش کە بابەتەکە پەیوەندیی بە تۆوە هەیە تا ڕاستییەکانت پێ بڵێم سەبارەت بە خۆت، نیگەران دەبم، چونکە من لە تۆ و هەڵسوکەوتەکانت بەرانبەر بە حەقیقەت دەترسم. کە لەبارەی خۆتەوە ڕاستییەکت پێ بڵێم، مەترسیی بۆ ژیان هەیە. لەهەمان کاتدا ڕاستییەکە پارێزەری ژیانە، وەلێ ڕێی تێدەچێت هەر ڕاستی ببێتە قوربانیی دەستی هەر چەتەیەک و داگیری بکات. ئەگەر وا نەبوایە، نە ئەوە دەبوویت کە هەیت و نە لە جێی خۆیشتدا دەبوویت.

ئاوەزم پێم دەڵێت: "بەهەر نرخێک بێت، ڕاستییەکە بڵێ." پیاوە بچووکەکەی ناخیشم دەڵێت: "خۆخستنە بەردەستی پیاوە بچووکەکە و خۆدان بەدەست بەزەییەکەیەوە گەمژەییە. ئاخر پیاوە بچووکەکە نایەوێت هیچ شتێکی ڕاست سەبارەت بە خۆی ببیستێت. ئەو بەرپرسیارێتییە گەورەیەی ناوێت کە هی خۆیەتی. ئەو دەخوازێت وەکوو پیاوی بچووک بمێنێتەوە، یان دەیەوێت ببێت بە پیاوێکی گەورەی بچووک. گەرەکیەتی ببێتە کەسێکی زەنگین، یان سەرکردەی پارتییەکی سیاسی، یان فەرماندەی سوپایەک، یان ببێت بە سکرتێری ڕێکخراوی لەناوبردنی تاوانی کۆمەلایەتی. بەلام نایەوێت

بەرپرسیاریتیی کارەکەی لەئەستۆ بگرێت سەبارەت بە پەیداکردنی خۆراک، بنیادنانی خانووبەرە، هۆیەکانی هاتوچۆ، پەروەردە، توێژینەوە و بەڕێوەبردن، یان هەر کارێکی تر بێت."



تەنیا خودی خۆت دەتوانیت ببیتە ڕزگارکەری خۆت!

# پیاوە بچووکەکەی ناخم دەڵێت:

"تـۆ بوویـت بە پیـاوێکی مەزن، پیـاوێکی ناسـراو لە ئەڵمانیـا و نەمسـا، سـکەندەناڤیا، ئینگلـتەرا، ئەمریکـا، فەلەسـتین، هتـد. کۆمۆنیسـتەکان لە دژت جەنگـان. 'پـارێزەرانی بەهـا فەرهەنگییەکـان' ڕقیـان لێـتە. خوێنـدکارەکانت تۆیـان خۆشـدەوێت. ئەو نەخۆشـانەی چارەسـەرت کـردوون ڕێـزت لێدەگرن. ئەو بەدخـوازانەی کە تووشی ڕەشەمەرگی[1] سۆزداری بوون و ئازاری پێوە دەچێژن، بەدواتەوەن.

"تۆ دوانزە کتێب و سـەدوپەنجا وتارت سـەبارەت بە ئـازار و بێئومێـدیی ژیـان و نەگبەتیـی پیـاوە بچـووکەکە نووسـیوە. دۆزیـنەوە و بیردۆزەکانـت لە زانکۆکـان دەوتـرێنەوە؛ پیـاوانی تـری تەنیـا و مەزن پێت دەڵێن: 'تـۆ پیـاوێکی زۆر مەزنیـت. تـۆ هاوشـێوەی پیـاوە زۆر بلیمەتەکـانی مێـژووی زانسـتیت. تـۆ خـاوەنی گەورەتـرین دۆزیـنەوەی زانسـتییت لە سـەدەکاندا، وزەی ژیـانی گەردوونـی و یاسـای کـردارە زینـدووەکانت دۆزیـونەتەوە. وات کـرد بتـوانن لە نەخۆشـیی شـێرپەنجە تێـبگەن. لە

[1] ڕەشەمەرگ: تاعوون، چاوەقووڵکە، بامرنێ

ولاتـێکەوە بـۆ ولاتێکـی تـر دەربەدەر بوویـت، چـونکە حەقیقەتت وتووە. ئێستایش ئەمانە وەلاوە بنێ و چێژ لە بەرهەمـی هەوڵەکانـت و بەناوبانگبوونـت ببینـە. لەچەنـد ساڵێکی کەمدا، ناوت لە هەموو شوێنێک دەبیسترێت و دەکەوێتە سەر زاران. کارێکی زۆرت ئەنجام داوە. ئێستا دەست هەڵبگرە و بگەڕێوە سەر لێکۆڵینەوەکانت و سەر یاسا جێبەجێکارییەکانی سروشت!"

هۆ پیاوە بچووکەکە! ئەم پیاوە بچووکەی ناخم کە لێت دەترسێت، بەم شێوەیە قسە دەکات.

بـۆ مـاوەیەکی زۆر پەیوەنـدییەکی نـزیکم لەگەڵتـدا هەبـوو، چـونکە لەڕێـی ئەزمـوونی خـۆمەوە ژیـانی تـۆم دەناسـی، چـونکە دەمویسـت یارمەتیـت بـدەم. مـن ئەو پەیوەندییەم پاراسـت، چـونکە بینـیم بەڕاسـتی یـارمەتیم داویت و، تۆیش پێویستیت بەیارمەتیی منە، زۆر جار بە چـاوی فرمێسـکاوییەوە ئەو یـارمەتییەت وەردەگـرت. بەرەبەرە ئەوەم دەبینـی کە دەتویسـت ئەو یارمەتییەم لـێ وەربگریت، بەڵام نەتدەتوانی بەرگریی لێ بکەیت. لەبری تـۆ بەرگـریم لـێ دەکـرد و سەرسـەختانە لە پێناوتـدا دەجەنگـام. هەنگینـێ[1] سـەرگەورەکانت دەهـاتن و کارەکەمیـان تێـک دەدا. تـۆیش بە بێـدەنگی مـایتەوە و دوایان کەوتیت. ئێستایش ئەو پەیوەندییەم پاراستووە بۆ

---

[1] هەنگینێ: هەنگین، هەنگێ، پاشان، دواتر

ئەوەی فێرببم کە چۆن کەسێک بتوانێت بێ ئەوەی ڕەنج بەخەسار بێت، یارمەتیت بدات، چ وەک سەرگەورەت یان قوربانیی دەستت. پیاوە بچووکەکەی ناخی من ویستی تۆ بەدەستبهێنێت و بتپارێزێت، دەیویست هەمان ئەو ڕێزەی لێ بگریت کە لە زانایەکی بیرکاری دەگریت، چونکە کەمترین زانیاریت لەبارەی ئەو زانا بیرکارییەوە نییە. تا کەمتر لە شتێک تێبگەیت، زیاتر ڕێزی دەگریت. تۆ هیتلەر باشتر لە نیتچە، ناپلیۆن باشتر لە پێستالۆتزی دەناسیت. بۆ تۆ پاشایەک گرنگیی لە سیگمۆند فرۆید زیاترە. پیاوە بچووکەکەی ناخم دەیەوێت بەو شێوە باوەی کە سەروەرەکانت دەیکەن، بەدەستت بهێنێت. ئەگەر پیاوە بچووکەکەی ناخم "بۆ ئازادی ڕێبەرایەتیت بکات،" ئەوا لێت دەترسم. ڕەنگە بتوانیت خۆت لە مندا و من لە خۆتدا بدۆزیتەوە، لەوانەیە بتۆقیت و خۆت لەمندا بکوژیت. بەم هۆیەوە، من کۆڵم لەوە داوە لە پێناو ئازادیی تۆدا بمرم و ببمە کۆیلەی هەر کەسێک.

دەزانم تۆ ناتوانیت لەوە تێبگەیت کە ئێستا پێم وتیت: "ئازادبیت لەوەی ببیتە کۆیلەی هەر کەسێک" بابەتێکی سادە نییە.

بۆ ئەوەی چیتر کۆیلەی تاکە گەورەیەک نەبیت، بۆ ئەوەی ببیتە کۆیلەی هەر کەسێک، ئەوا سەرەتا پێویستە دەسەڵاتی ستەمکارەکە بسڕیتەوە، یا وا دابنێین ئەو دەسەڵاتە قەیسەرە. ئەگەر کەسێک پاڵنەری ئازادی و شۆڕشگێڕانەی نەبێت، ناتوانێت ئەم کوشتارە سیاسییە ئەنجام بدات. دواتر مرۆڤ پارتییەکی ئازادیخوازی شۆڕشگێڕ دەدۆزێتەوە بە ڕابەرایەتیی سەرکردەیەکی مەزن، با بڵێین ئەو سەرکردەیە مەسیح، مارکس، لینکۆڵن یان لینین بێت. ئەو پیاوە مەزنەیش بابەتی ئازادبوونی ئێوەی بە هەتەر[1] لە ئەستۆ گرتووە. جا بۆ ئەوەی بتوانێت بەشێوەیەکی کردارییانە ئەمە جێبەجێ بکات، نیازی بەوەیە هەندێک پیاوی بچووک، وەکوو یارمەتیدەر لە دەوروبەری خۆی کۆبکاتەوە، چونکە خۆی بە تاقی تەنیا ناتوانێت ئەو کارە مەزنە ئەنجام بدات. سەرباری ئەمەیش، تۆ لێی تێناگەیت و، ئەگەر کۆمەڵێک پیاوی زلی بچووکی لە دەوری خۆی کۆ نەکردایەتەوە، ئەوا پشتگوێت دەخست. بە کە کۆمەڵێک پیاوی زلی بچووک لە دەوری بن، دەتوانێت دەسەڵات، یان چمکێک لە حەقیقەت، یان

---

[1] هەتەر: جددی

باوەڕێکی نوێی باشترت بۆ بەدەست بهێنێت. قەوینتی[1] و چەند یاسایەکی ئازادیت بۆ دەنووسێت و، پشت بە یارمەتی و هەتەربوونی تۆ دەبەستێت. لەو زەلکاوە کۆمەڵایەتییەی تێی کەوتوویت دەرتدەهێنێت. بۆ ئەوەی کۆمەڵێک پیاوی زلی بچووک پێکەوە بهێڵێتەوە و، متمانەی تۆ لەدەست نەدات، پیاوی مەزنی ڕاستەقینە دەبێت قوربانی بە پارچە پارچەی مەزنیی خۆی بدات، کە توانیبووی، دوور لە تۆ و ژاوەژاوی ڕۆژانەت، لە قووڵترین تەنیایی هزریدا بەدەستی بهێنێت و، هێشتایش لەگەڵ ژیانی تۆدا لە پەیوەندییەکی نزیکدایە. هەر بۆ ئەوەی بتوانێت ڕابەرایەتیت بکات، ناچارە چاوی لەوە بپۆشێت کە بۆ خوایەکی وات گۆڕیوە، هیچ کەست دەستی پێی ڕاناگات. ئەگەر بەو شێوە سادە و ساکارەی خۆی بمایەتەوە، وەک پیاوێک بتوانێت ژنێکی خۆشبوێت بێ ئەوەی بەڵگەنامەی هاوسەرگیرییان هەبێت، ئەوا تۆ متمانەت پێ نەدەکرد. تۆ بەم جۆرە خوا تازەکەت دروست دەکەیت. ئەو دەمەی دەبێت بە خوایەکی تازە، پیاوە مەزنەکە گەورەییە بنچینەییەکەی خۆی لەدەست دەدات، چونکە گەورەییەکەی لەڕێی دڵسۆزی و سادەیی و بوێری و پەیوەندیی ڕاستەقینەی بە ژیانەوە بەدەست هێنابوو. پیاوە زلە بچووکەکانیش، ئەوانەی

---

[1] قەوینتی: وەسێت

گەورەییەکەیـــــان لە گەورەییـــــی پیـــــاوە مەزنەکەوە سـەرچاوەی گرتـووە، پـلەی بـالای ئـابووری، دیپلۆماسـی، حوکوومی، زانستی و هـونەری دەگرنە دەسـت و، تۆیش هەر لەو شـــوێنەی خۆتـــدا دەمێنیـــتەوە: لە زەلکـــاوەکەدا. تــۆیش بە ڕیپـــاڵی[1] بەرتەوە بەردەوام دەبیــت لە پێنـــاوی بەدەســـتهێنانی "داهـــاتووی سۆسیالیســـت" یـــان "ڕایخـــی سـێیەم." تـۆیش لەنێـو خـانووە پیسـە مـیچ قامیشـەکاندا بەردەوامـی بە ژیانـت دەدەیـت، کە دیوارەکـانی بە سـەنێر[2] داپۆشـراون. کەچـی شـانازی بە کۆشـکی فەرهەنگیـی نێـو شـــارەکەتەوە دەکەیـــت. بەو ســـاوێرە[3] قایلیـــت کە گـــوایە دەسەڵاتت بە دەستە و بەڕێوەی دەبەیت—تا جەنگێکی تر یان کەوتن و هەرەسهێنانی خوا تازەکەت.

---

[1] ڕیپاڵ: ڕینگاڵ، جلی کۆنە و دڕاو

[2] سەنێر: شیاکە

[3] ساوێر: وەهم



پیاوە زلە بچووکەکە

لە وڵاتە دوورەکاندا، پیاوە بچووکەکان چالاکانە و بە شێوەیەکی هەتەر لە شەیداییەکەت بۆ ئەوەی ببیت بە کۆیلەی هەر کەسێک کۆڵیونەتەوە و، بەو شێوەیەش فێربوون کە چۆن بە هەوڵێکی کەمی هزری، کەسێک دەتوانێت ببێت بە پیاوێکی زلی گزگل. ئەم پیاوە زلە گەورانەیش هەر مینا[1] تۆ بوون، لە کۆشک و دیوەخانەوە نەهاتوون. ئەوانیش وەکوو تۆ برسێتی و نەهامەتی زۆریان چەشتووە. تەنیا هەنگاوەکانی گۆڕینی گەورەکانیان کورت کردووەتەوە. ئەوان لەوە تێگەیشتوون کە سەد ساڵ لە هەوڵ و ماندوبوونی هزریی قورس بۆ ئازادیی تۆ، قوربانیدان لە پێناو خۆشبەختیی تۆ و، تەنانەت قوربانیدان بە ژیان بۆ ئازادیی تۆ، بە نرخێکی زۆر لەسەریان کەوتووە تا بتکەنە بەردەیەکی تازە. ئەوەی بیرمەندە مەزنەکانی سەربەستی لە سەد ساڵدا بەدەستیەوە ماندوو بووبوون و بنیادیان نابوو، توانرا لە ماوەی پێنج ساڵدا هەرەسی پێ بهێنرێت. پیاوە بچووکەکانی هاوشێوەی تۆیش هەنگاوەکانی ئەو کارەیان کورتکردووەتەوە: زۆر بە ئاشکرا و درندانە ئەنجامی دەدەن. زیاد لەوەیش، پێت دەڵێن: "تۆ و ژیانت، خێزان و منداڵەکانت یەکسانن بە هیچ، تۆ گەمژە و ریسوایت، کەسێک دەتوانێت هەرچیی پێ خۆش بێت پێتی بکات."

---

[1] مینا: وەکوو، وەک، چاوا، چوون

ئەوان بەڵێنی ئازادیی تاکەکەسیت پێ نادەن، بەڵکو بەڵێنی ئازادیی نەتەوەییت دەدەنێ. ئەوان بەڵێنی بڕوابەخۆبوونت نادەنێ، بەڵکو لەبری ئەوە فێری ئەوەت دەکەن چۆن ڕێز لە دەوڵەت بگریت. فێرت دەکەن چۆن سەروەری و گەورەیی نەتەوەییت لە پێش مەزنیی کەسێتیدا دابنێیت. چونکە "ئازادیی کەسێتی" و "مەزنیی کەسێتی" بەلای تۆوە هیچ نین، بەڵکو لێت بوون بە شتی ئاڵۆز و تەمومژاوی، لە کاتێکدا "سەربەستیی نەتەوەیی" و "بەرژەوەندییەکانی وڵات" لیک بە دەمتدا دێنە خوار، وەکوو ئەو سەگەی کلکەلەقە بەدیار ئێسقانێکەوە دەکات و لیک بە قەپۆزیدا دێتە خوارەوە. هیچ کام لەو پیاوە بچووکانە ناتوانن نرخی ئازادیی ڕاستەقینە بدەن، وەک ئەوەی مەسیح و جیۆردانۆ بونۆ و کارڵ مارکس و لینکۆڵن داویانە. ئەوان تۆیان خۆش ناوێت، بەڵکو سووکایەتیت پێ دەکەن، چوونکە ئەی پیاوی بچووک، تۆ خۆیشت سووکایەتی بە خۆت دەکەیت. ئەوان زۆر بە باشی تۆ دەناسن، باشتر لە ڕۆکفیلەر و تۆریز.[1] خراپترین

---

[1] ڕۆکفیلەر: دەستەیەک بوون لە ئەندامانی حیزبی کۆمارییەکانی ئەمێریکا لە ماوەی نێوان سالانی (١٩٣٠ز. – ١٩٧٠ز.).

تۆریز: ئەم دەستەواژەیە وەک ناسناوی ئەندامانی حیزبی پارێزکارانی بەریتانیا بەکار دەبرێت. (هەڵەچن)

ئەو خاڵە لاوازانەی ژیانت دەزانن کە دەبوو تەنیا خۆت بتزانیبایەن. ئەوان تۆیان کردووە بە قوربانی هێمایەک و، تۆیش بۆ کۆڵ هەڵیاندەگریت و دەیانگەیەنیتە دەسەڵات تا فەرمانت بەسەردا بکەن. سەرگەورەکانت بەبۆنەی تۆوە بەرزبوونەتەوە، خودی خۆت پەروەردەت کردوون، سەرەڕای ئەو ڕاستییەیش کە دەمامکەکانیان فڕێ دا. ڕوون و ڕەوان پێت دەڵێن: "تۆ کەسێکی کەم بەها و ژێردەستەیت و هەست بە بەرپرسیاریتی ناکەیت و، هەروایش دەمێنیتەوە." بەڵام لەبەرانبەردا، تۆ بە "ڕزگارکەر" و "ئازادکەری نوێ" ناویان دەبەیت و، بژی بژییان بۆ دەکەیت.

ئاخر لەبەر ئەمەیە کە من لێت دەترسم و زراوم چووە، هەی پیاوی بچووک. چونکە چارەنووسی مرۆڤایەتی لەسەر تۆ بەندە. لێت تۆقیوم، چونکە تۆ هێندەی لە خۆت هەڵدێیت، لە هیچ شتێکی تر هەڵنایەیت. ئەهای پیاوە گزگلەکە! تۆ نەخۆشیت، زۆر نەخۆشیت. ئەمە هەڵەی تۆ نییە. وەلێ ئەوە بەرپرسیاریتیی تۆیە کە خۆت لەم نەخۆشییە ڕزگار بکەیت. زۆر لەمێژ بوو دەتتوانی خۆت لە کۆتی یەخسیریی چەوسێنەرەکانت قوتار بکەیت، ئەگەر لە هەمبەریان ئارامگر نەبوویتایە و دەستی کۆمەکت بۆ درێژ نەکردنایە. ئەگەر لە ژیانی کردەییتدا یەک تۆز ڕێزت لە خۆت بگرتایە، ئەوا هیچ هێزێکی پۆلیسی لە دونیادا نەیدەتوانی ژێردەستەت بکات،

ئەگەر بتزانیایە، لەڕاستیشدا دەزانیت، کە ئەم دنیایە بەبێ تـــۆ تەنیـــا بـــۆ کـــاتژمێرێکیش بەردەوام نابێـــت. ئایـــا "ڕزگـارکەر"ەکەت ئەمەی پێ وتییـت؟ دەی دیـارە نەخێر. ئەو بە "پرۆلیتاریـای هەمـوو جیهـان" نـاوی بردیـت، بەڵام هەرگیز پێی نەوتیت، تەنیا خـودی خـۆت و کەسـی تر نـا، *بەرپرسـیاری ژیـانی خۆتیـت*(لەبـری بەرپرسـیاربوون بەرانبەر بە "ئابڕووی وڵاتەکەت.")

دەبێـت درک بەوە بکەیـت کە ئەوە خۆتیـت پیـاوە بچووکەکـانی خۆتـت بەسـەر خۆتـدا زاڵ کـردوون و کـردووتن بە چەوسـێنەرانی خـۆت و، مـرۆڤە مەزنەکـانی خۆیشت کردنە بەقوربانی؛ لە خاچتدان و واتکرد لە برسدا بمـرن؛ بیـرت لێنەکـردنەوە و گوێـت بەو کـار و مانـدووبوونەیان نەدا کە لەپێنـاوی تـۆدا کردیـان، تـۆ هەر نازانیـت بـۆ ئەو خۆشـییانەی لە ژیانیشـتدا هەن، قەرزارباری کێیت.

تۆ دەڵێیت: "بەرلەوەی متمانەت پێ بکەم، دەمەوێت فەلسەفەی ژیانت بزانم." ئەو دەمەی کە فەلسـەفەی ژیـانم دەبیستیت، تێیدەتەقێنیت و خۆت دەگەیەنیتە پارێزەرەکانت و دادوەرانـی نـاوچەکە، یـان "ئەنجـوومەنی قەڵاچـۆکردنی چالاکیی دژ بە ئەمەریکییەکان" یان "ئێف. بی. ئای." یان "جـی. پـی. یـو." یـان "ڕۆژنـامەی زەرد،" یـان کوکلـوکس کـران، یـان "ڕابەرانـی کرێکـارانی جیهـان" یـان دواجـار بە ئاسانی هەڵدێیت.




# ڕزگارکەرە نوێیەکان

من نه سوورم، نه ڕەش، نه سپی، نه زەرد.

مـن نه مەسـیحاییم، نه جـوولەکە، نه موسـوڵمان، نه مۆرمەن[1]، نه بڕوام به فرەژنی هەیه، نه هاوڕەگەزبازم، نه ئاژاوەچی، نه مشتەکۆڵەبازیش.

ژنەکەم له ئـامێز دەگـرم، چـونکه ئەویندارمه، نەک لەبەر ئەوەی بەڵگەنـامەی هاوسـەرگیریم هەیه، یـان لەبەر ئەوەی بۆ سەرجێییکردن ئاڵۆشم تێ بەربووبێت.

هەرگیـز له منـداڵان نـادەم، ڕاوی ماسـی و ئاسـک و کەرویشکیش ناکەم. بەڵام نیشانشکێنێکی باشم و حەز به نیشانەپێکان دەکەم.

یـاریی کـاغەز نـاکەم و ئـاهەنگیش سـاز نـاکەم تـا بیردۆزەکانم بڵاو بکەمەوە. ئەگەر بیرۆکەکانم ڕاست بن، ئەوا خۆیان بڵاو دەبنەوە.

کـارەکەم نـاخەمه بەردەسـت هـیچ دەسـەڵاتێکی تەندروستییەوە مەگەر لەم کـارەدا له مـن باشـتر کـارزان بێت. هەر خۆم بڕیاردەدەم که کێ دەتوانێت له زانیـاری و ئاڵۆزیی دۆزینەوەکانم تێبگات و کێیش لێیان تێناگات.

کاتێـک هەر یاسـایەک ئاوەزپەسـەند[1] بێـت، مـن به وردی سـەرنجی لـێ ڕادەگـرم، دژیشـی دەوەسـتمەوە که

---

[1] ئەندامی کڵێسه و کۆمەڵەیەکی ئەمێریکی.

بەسەرچوو و بێمانابێت(هۆ پیاوی گرگن! ڕامەکە بۆلای پارێزەرەکەت، چونکە ئەویش ئەگەر نارەسەن نەبێت، هەر وا دەکات.)

دەمەوێت منداڵان و هەرزەکاران بە ئەوینەوە ئەزموونی خۆشبەختیی جەستەییان بکەن و بەبێ ترس چێژی لێ وەربگرن.

بڕوام وا نییە بۆ ئەوەی مرۆڤ ببێت بە دیندارێکی باش و ڕاستەقینە، دەبێت خۆشەویستیی خۆی لەناو ببات و ڕوح و جەستەی وشکوبرنگ بکات و دەستبەرداری هەموو شتێک ببێت.

دەزانم ئەوەی ناوت لێ ناوە "خوا" هەر بەڕاستی بوونی هەیە، بەڵام بەشێوەیەکی جیاواز لەوەی بیری لێ دەکەیتەوە؛ خوا وەکوو وزەی سەرەکیی گەردوونیی نێو گەردوونە، مینا ئەوین لەنێو جەستەی خۆتدا، چوون ڕاستگۆیی و هەستی خۆت بۆ سروشت لەنێو ناخی خۆت و دەوروبەرتدا.

هەر کەسێک لەژێر هەر پاساوێکدا دەست بخاتە نێو کارە پزیشکی و پەروەردەییەکانمەوە کە لەگەڵ منداڵێک یان نەخۆشێکدا خەریکم، بە ئاسانی دەرگای بۆ دەکەمەوە و دەیکەمە دەرەوە. گەر بیشدرێمە دادگا، ئەوا هەندێک

---

[1] ئاوەزپەسەند: عقلاني

پرسیاری سادە و ڕوونی لێ دەکەم کە نەتوانێت وەڵامیان بداتەوە و تا ماوە هەست بە شەرمەزاری بکات. ئاخر من پیاوێکی کارکەرم کە ناخی مرۆڤ دەناسێت و لێی بەئاگایە و، دەیەوێت "کار" فەرمانڕەوایی جیهان بکات، نەک تێڕوانین سەبارەت بە کار. من بۆچوونی تایبەتیی خۆمم هەیە و، دەتوانم درۆ لە ڕاستی هەڵاوێرم[1] کە هەموو کاتژمێرێکی ڕۆژ ئەم ڕاستییە وەک کەرەستەیەک بەکار دەهێنم و دوای بەکارهێنانیشی خاوێنی دەکەمەوە.

پیاوی بچووک! لە قووڵایی ناخمەوە لێت دەترسم. منیش هەر وەک ئێستا نەبووم. منیش پیاوێکی بچووک بووم لەنێو ملیۆنان پیاوی بچووکی تردا. دواتر بووم بە زانایەکی سروشتی و دەروونپزیشک و، فێربووم ببینم چەندە نەخۆشیت و نەخۆشییەکەت چەندە ترسناکە. فێربووم ئەو ڕاستییە ببینم کە ئەوە نەخۆشییەکی سۆزەکیی خودی خۆتە و، هیچ هێزێکی دەرەکی نییە کە هەموو کات و ساتێک دەتچەوسێنێتەوە، تەنانەت ئەو کاتانەیشی هیچ پەستانێکی دەرەکی بوونی نەبووە. دەتوانیت زۆر لەمەوبەر بەسەر ئەوانەی ستمیان لێت کردووە زاڵ ببوویتایە، ئەگەر لە ناختەوە زیندوو و تەندروست بوویتایە. ئەوانەی بەرانبەرت ئائلن[2] هەر

---

[1] هەڵاواردن: جیاکردنەوە(هەڵاوێرم: جیا بکەمەوە)

[2] ئائل: ستەمکار و چەوسێنەر

هاوشـانی خـۆتن و مینـا ڕابـردوو سـەر بە چینـی بەرزی کۆمەڵگا بوون. نەخاسمە[1] ئێستا لە خۆت بچوکترن، هەی پیـاوی بچـووک! ئەوان شـتێکی باشـیان لە بچـووکی بەدەستهێناوە، بۆ ئەوەی لە ڕێی ئەزمـوونەوە لە کلۆڵیت شـارەزا بـبن و ئەو شـارەزاییە بەکـار بهێـنن بـۆ ئەوەی باشتر و دڕندانەتر بتچەوسێنێتەوە.

تـۆ هـیچ ئەنـدامێکی هەسـتکردنت نییە تـا هەسـت بە پیـاوی مەزنـی ڕاسـتەقینە بکەیـت. بـوونی، ئازارکێشـانی، پەرۆشیی، تووڕەییی، خەباتی لە پێناوتدا، بە تۆ نـامۆن. تۆ ناتوانیـت لەوە تێبگەیـت کە پیـاوان و ئافرەتانێـک هەن نایانەوێـت بەسـەرتدا زاڵـبن و بتچەوسـێننەوە و، لەوە تێناگەیـت کەسـانێک هەن ڕاسـتگۆ و ڕاسـتەقینەن و دەیانەوێـت تـۆ ئازادبیـت. تـۆ ئەم ژن و پیـاوانەت خـۆش ناوێـت، چـونکە ئەمـانە بە بوونـت نـامۆن. ئەوان سـادە و سەرڕاسـتن؛ بەلای ئەوانەوە ڕاسـتی بەنـرخە، وەک چـۆن بەلای تـــۆوە ئۆینبـــازی[2] بەنـــرخە. ئەوان بە چـــاوی گـــاڵتەپێکردنەوە تەماشـــات نـــاکەن، بەڵکـــو بەدەســـت چارەنووسـی مرۆڤەکـانەوە ئـازار دەچێـژن؛ وەلـێ تـۆ وا هەست دەکەیت چاودێری دەکرێیت، بۆیە هەست بە ترس

---

[1] نەخاسمە: تەنانەت

[2] ئۆینبازی: تەڵەکەبازی، فێڵبازی(ئۆین: فێڵ)

دەکەیت. هەی مێردەک![1] تۆ تەنیا کاتێک دانیان پێدا دەنێیت کە چەند پیاوێکی فیسقل[2] پێت بڵێن: ئەم پیاوە مەزنانە، مەزنن. تۆ لە پیاوی مەزن دەترسیت، لە نزیکییان لە ژیان، لە خۆشەویستییان بۆ ژیان زەندەقت چووە. مرۆڤی مەزن بە سادەیی تۆی خۆش دەوێت وەک ئاژەڵێکی زیندوو، وەک بوونەوەرێکی زیندوو. ئەو نایەوێت گوێی لە چەنەچەنت بێت، وەک چۆن سەدان ساڵە چەنە دەدەیت. پێی خۆش نییە وەکوو ئاژەڵی بارلێنراو بتبینێت، چونکە ئەو ژیانی خۆشدەوێت و دەیەوێت ئازاد و سەربەست بیت و دووربیت لە ناڵین و ڕسوایی.

[1] مێردەک: بۆرەپیاو، پیاوی بچووک

[2] فیسقل: وشەیەکە بۆ سووک و کەمبایەخکردن و بچووک پیشاندانی شتێک بەکار دێت.



**ئاهەنگە کۆمەڵایەتییە پووچ و پڕ لە چەنەچەنەکانت**

تۆ مرۆڤە مەزنەکان بە ئاقارێکدا دەبەیت و دەیانگەیەنیتە ئاستێک کە سوکایەتیت پێ بکەن، بە دەست تۆ و بچووکیتەوە ئازار بچێژن و لێت بکشێنەوە، خۆیان لێت بەدوور بگرن، لە هەمووی خراپتر ئەوەیە کە بەزەییان پێتدا بێتەوە. هەی پیاوی مێردەک! ئەگەر ڕێک بکەوێت و بوویت بە دەروونپزیشک با بڵێین وەکوو لۆمبرۆسۆ، ئەوا تۆ مرۆڤی مەزن بە جۆرێک لە تاوانبار یان بە تاوانبارێک کە نەیتوانیوە کاری باش بکات یان بە نەخۆشیێکی عەقڵی لە قەڵەمی دەدەیت. ئاخر مرۆڤی مەزن وەک تۆ نییە، ئەو ئامانجی ژیانی لە کۆکردنەوەی سەروەت و سامان، یان دۆزینەوەی مێردێکی گونجاو بۆ کچەکانی، یان بەدەستهێنانی پۆست و پلەیەکی سیاسی، یان ئەکادیمی یان خەلاتی نۆبڵدا نابینێتەوە. لەبەر ئەم هۆکارەیشە ئەو لە تۆ ناچێت و، بە "بلیمەت" یان "نائاسایی" ناوی دەبەیت. ئەویش، لەلایەکەوە، وازی لێیە[1] ئەوە بخاتەڕوو کە کەسێکی بلیمەت نییە، بەڵکو مرۆڤێکی سادەیە. تۆ بە "گۆشەگیر" ناوی دەبەیت، ئاخر ئەو پێی باشترە لەگەڵ بیرکردنەوە و لێکۆڵینەوەکەیدا یان تاقیگە و کارەکەیدا بمێنێتەوە، نەک تێکەڵ بە ئاهەنگە کۆمەلایەتییە پووچ و پڕ لە چەنەچەنەکانت ببێت. بە شێت ناوی دەبەیت لەبەر ئەوەی ئەو پارەکانی لە توێژینەوەی زانستیدا خەرج

[1] وازلێبوون: پێخۆشبوون

دەكات، نەک مینا تۆ لە کرێی پشکی بازرگانیدا بەکاریان بهێنێت. تۆ، هۆ پیاوە بچووکەکە! لەوپەڕی هەرەس و نزمیەتەوە بەو مرۆڤە سادە و دڵسۆز و سەرڕاستە دەڵێیت: "نائاسایی" و، بە خۆتی بەراورد دەکەیت، کە نموونەی کەسێکی ئاساییت. بەو پێوانە بچووکەی کە بۆ ئاساییبوون داتناوە، دەپێویت و ئەوەت بۆ دەردەکەوێت یەک ناگریتەوە لەگەڵ ئەو پێوەرانەی بۆ ئاساییبوون داتناون. کورە هەی گزگل! تۆ ناتوانیت ئەوە ببینیت کە ئەوە خۆتیت وات کردووە ئەو کەسەی پڕبەدڵ خۆشی دەوێیت و ئامادەیە بۆ یارمەتیدانت، بە چ ئاقارێکتدا بردووە و لە ژیانی کۆمەڵایەتی داتبڕیوە، چونکە تۆ ژیانت کردووە بە شتێک، کە هیچ کەسێک، چ کۆشکنشین یان خەراباتنشین، بەرگەی ناگرێت. کێ ئەو مرۆڤەی لە دوای چەندین دەیە لە ناڵین و ئازارچەشتن و دڵشکان، کردووە بەو مرۆڤەی ئێستا؟ ئەوە تۆیت بە هۆی هەستنەکردن بە بەرپرسیارێتی و بیرتەسکی و هەڵەبیرکردنەوە و ڕاستییە چەقبەستووە هەتاهەتاییەکانتەوە کە ناتوانن بۆ ماوەی دە ساڵ خۆیان لەبەردەم گەشەسەندنە کۆمەڵایەتییەکاندا ڕابگرن. تەنیا بیر لەو هەموو شتانە بکەرەوە کە لەو ماوەکەمەی نێوان جەنگی جیهانگرەوەی یەکەم و دووەمدا سوێندت خواردووە کە ڕاستن. چەند لەوانەت بۆ دەرکەوتن کە هەڵەن و، لە چەندیان پاشگەز بوویتەوە؟ بەدڵنیاییەوە هیچیان، هەی پیاوی بچووک. مرۆڤی مەزنی

ڕاستەقینە بە پارێزەوە[1] بیردەکاتەوە، بەڵام هەر کە چنگی لە بیرۆکەیەکـی گرنـگ گیربـوو، بـۆ مـاوەیەکی زۆر بە وردی بیری لێ دەکاتەوە. ئەوە تۆیت هۆ پیاوی کوڵەبنە[2]، کاتێک بیرکـردنەوەی مرۆڤـی مەزن ڕاسـت دەردەچێت و زیـاتر دەمێنێـتەوە و، بیرکـردنەوەی خـۆت بێکەڵـک و بەسـەرچووە، پیاوی مەزن قێزەون و نەویسـت دەکەیت. کە نەویست و بێکەڵکیشت کرد، تۆوی تەنهاییەکی تۆقێنەر لەناویـدا دەچێنیـت. نەک تـۆوی تەنهـاییەک کە بەرهەمـی گەورەی لێوە پەیدا بێت، بەڵکو تۆوی ترس لەوەی کە تۆ لێی تێنەگەیت و خراپ مامەڵەی لەگەڵدا بکەیت. چونکە تۆ "خەڵک"یت، "ڕای گشتی" و "ویژدانی کۆمەڵایەتی"یت. ئایا "پیـــاوی بچـــووک،" هەرگیـــز بەڕاســـتی بیـــرت لەو بەرپرســـیاریەتییە گەورەیە کـــردۆتەوە کە لەمەدا هەیە؟ ئایـا—هەر بەڕاســت—هـیچ کـات پرسـیارت لە خـۆت کـــردووە کە بیرکردنەوەکانـــت ســـەبارەت بە ڕووداوە کۆمەڵایەتییە درێژخایەنەکان، سروشت، کارە مەزنەکانی مرۆڤایەتی، با بڵێین کارەکانی مەسیح، ڕاستن بوون یان نـا؟ نەخێـر، تـۆ پرسـیار لە خـۆت ناکەیـت کە ئـاخۆ بیرکردنەوەکانـت هەڵەن یـان نـا. لەبـری ئەوە، لە خـۆت دەپرسیت ئاخۆ دراوسێکانت سـەبارەت بە تۆ چۆن بیـر

---

[1] بە پارێزەوە: بە حەزەرەوە

[2] کوڵەبنە: کورتەباڵا، گرگن

دەکەنەوە، یان ئاخۆ ڕاستگۆیی چەندە پارەی تێدەچێت.
هەی فیسقل! تۆ لەمانە بترازێت، پرسیاری تر لە خۆت ناکەیت؟



لەبری ئەوە، لە خۆت دەپرسیت ئاخۆ
دراوسێکانت سەبارەت بە تۆ چۆن بیر
دەکەنەوە، یان ئاخۆ ڕاستگۆیی چەندە پارەی
تێدەچێت.

دوای ئەوەی ئەو مــرۆڤە مەزنەت بەرەو تەنهــایی بــرد، ئەوەت بیرچوو کە چ کارێکت پێکرد. هەر قسـەی پووچ و بێمانات دەکرد، سووکایەتیت پێ دەکرد و، بوویتە مـایەی ژان و ئـازارێکی قـووڵتر بـۆی. تـۆ ئەوەت بیرچـوو، بەڵام ئەوە سروشتی مرۆڤی مەزنە کە بیری نەچێتەوە و هەوڵی تۆڵەسـەندنەوەیش نەدات، لەبـری ئەوە هەوڵـدەدات لەوە تێبگـات بـۆچی وا بە خراپـی هەڵسـوکەوتت کـرد. دەزانـم ئەمە شـتێکی نـامۆیە بە بیرکـردنەوە و هەسـتەکانت. لـێ بـڕوام پـێ بـکە: ئەگەر بـۆ سـەدان و هەزاران و ملیۆنـان جـاریش ببیـتە مـایەی ئـازار بـۆی، ئەگەر ببیـتە مـایەی برینێـک کە سـاڕێژ نەبێـت—نەخاسـمە دوای مـاوەیەکی کەمیش بیرت بچێتەوە و نەزانیت کە چیت کـردووە،—ئەو مرۆڤە مەزنە لەبری تۆ ئازار بۆ کارە هەڵەکانت دەچێژێت، نەک لەبەر ئەوەی کـارە هەڵەکانـت گەورەن، بەڵکـو لەبەر ئەوەی زۆر هیچوپووچانەن. ئەو دەیەوێت لەوە تێبگات کە چـی پـاڵ بە تـۆوە دەنێـت ئەو کـارانە ئەنجـام بـدەیت؟ بە نمـوونە نـاوی هاوسـەرەکەت لەکەدار بکەیـت و بەخـراپە نـاوی بهێنیـت، هەر لەبەر ئەوەی کە نائومێـدی کردوویـت. یان چی وات لێ دەکات ئەشکەنجەی منداڵەکەت بدەیت تـا دڵی دراوسێ نەگریسەکەت ڕابگریت؛ چـی وات لـێ دەکـات بە چـاوێکی سـووکەوە تەماشـای مرۆڤـی دڵاوا بکەیـت و

بیخاپێنێت[1]؛ چی وات لێ دەکات کە هەرچیت پێ درا، وەری بگریت، بەڵام هەرگیز ئەوە نەبەخشیت کە بە خۆشەویستییەوە پێت بەخشراوە؛ چی وات لێ دەکات شەق لەو کەسە بدەیت کە کەوتووە، یان خەریکە دەکەوێت؛ چی وات لێدەکات کە درۆ بکەیت لەو شوێنەی کە پێویستە ڕاستی بڵێیت و هەمیشە دژایەتیی ڕاستی بکەیت، لەبری ئەوەی دژایەتیی درۆ بکەیت. هەی پیاوی بچووک! تۆ هەمیشە لە بەرەی ڕاستیشێوێنەکانیت.

هۆ پیاوە باڵافسەکە! پیاوە مەزنەکە بۆ ئەوەی ئارەزوو و هاوڕێیەتییە بێسوودەکەت بەدەست بهێنێت، پێویستە خۆی لەگەڵ تۆدا بگونجێنێت، ناچارە بەو شێوەیە قسە بکات کە تۆ دەیکەیت، ناچارە خۆی بە ڕەوشتی تۆ بڕازێنێتەوە. بەڵام ئەگەر ڕەوەشتی وەک تۆ بێت و زمان و شێوازی هاوڕێیەتیکردنی تۆ بەکار بهێنێت، ئەوا ئیدی مرۆڤێکی مەزن و ڕاست و سادە نامێنێتەوە. بەڵگەیشم: هاوڕێکانتن کە بەو شێوەیە قسەت لەگەڵ دەکەن کە تۆ دەتەوێت، هەرگیز مرۆڤی مەزن نەبوون.

---

[1] خاپاندن: فریودان، هەڵخەڵەتاندن(بیخاپێنێت: فریوی بدەیت)



به دزییەوە سووکایەتی بە خۆت دەکەیت،
تەنانەت کاتێک—یان بەتایبەتی کاتێک—
شکۆی خۆت بە مەزنی دەخەیتە ڕوو.

تـۆ لەو بـڕوایەدا نیـت هـاوڕێکەت بتوانێت کـارێکی مەزن ئەنجـام بـدات. تـۆ بە دزیـیەوە سـووکایەتی بە خـۆت دەکەیت، تەنانەت کاتێک—یان بەتایبەتی کاتێک— شکۆی خۆت بە مەزنی دەخەیتە ڕوو و، لەبەر ئەوەی بە سووکی تەماشای خۆت دەکەیت، ناتوانیت ڕێز لە کەسێک بگریت کە هـاوڕێتە. تـۆ ناتوانیـت بـڕوا بەوە بکەیـت کە کەسـێک لەسەر هەمان مێز لەتەنیشتتدا دانیشتووە، یان لە هەمان ماڵدا لەگەڵتدا دەژی، بتوانێت کارێکی مەزن ئەنجام بدات. هۆ پیاوی بچووک! لە نزیک تۆوە ئەستەمە بتوانرێت بیر بکرێتەوە. ئاخر لەگەڵ تۆدا تەنیا ئەوەندە دەکرێت بیر لە تۆ بکرێتەوە نە زیاتر. چونکە هەموو بیرکردنەوە مەزن و مژدەبەخشـەکان دەخنکێنیـت. گەر دایـک بیـت، هەر کە منداڵەکەت دونیای خۆی دەدۆزێتەوە، پێی دەڵێیت: "ئەمە بۆ منداڵ ناشێت." ئەگەر پرۆفیسۆر بیت لە زیندەوەرزانیدا بە خوێنـدکارەکانت دەڵێیـت: "ئەوە لە خوێنـدکارە بەڕێزەکان ناوەشێتەوە کە گومان بکەن. ئاخر چۆن شتی وا دەبێـت کە گومانـت هەبێـت لە بیـردۆزەی 'بـوونی میکـرۆب لە هەوادا'؟" ئەگەر مامۆسـتا بیـت بە خوێندکارەکانت دەڵێیت: "منداڵ دەبێت گوێ بگرێت، نابێت قسە بکات." ئەگەر ژنیش بیت دەڵێیت: "ئۆهۆو دیسانەوە دۆزینـەوە! تـۆ و دۆزیـنەوە! بـۆچی وەکـوو ئەو خەڵـکە ناچیتە سەر کارەکەت و بژێویی ژیانێکی شکۆمەندانە بۆ خێزانەکەت پەیدا بکەیت؟" پیاوی بچووک! هەر شتێک لە

ڕۆژنامەدا بوترێت، بڕوای پێ دەکەیت، جا لێی تێبگەیت

یان نا."



میکرۆبەکانی ناو هەوا

پیـاوی کـوڵەبنە، مـن پێـت دەڵـێم: تـۆ بەرانـبەر بەو شـتە باشـــانەی لە خۆتـــداهەن، هەســـتت لەدەســـت داوە و، خنکانـــدوونت. لەهەر کەســـێکی تـــردا بەدیـــی بکەیـــت دەیمرێنیت، جا گرنگ نییە ئەو کەسـە منداڵەکانت، ژنەکەت، مێـردەکەت، یـان دایـک و باوکـت بێـت. تـۆ بچووکیـت و دەیشتەوێت هەر بە بچووکی بمێنیتەوە.

لێم دەپرسیت: "چۆن ئەو هەموو شتانە دەزانیت؟"

پێتی دەڵێم: تۆم تـاقیکردووەتەوە، ئەزمـوونم لەگەڵتدا هەیە، خۆمم لە تۆدا بینیوە، وەکوو پزیشکێک تۆم لە شتە هیچوپووچەکـان ڕزگـارکردووە، مینـا مامۆسـتایەک زۆر جـار بەرەو سەرڕاسـتی و ڕاشـکاوی ڕێـبەریم کردوویـت. هەر مـنم دەزانـم چـۆن خـۆت بەرەنگـاری ڕاسـتگۆیی دەبیتەوە، دەزانـم چ ترسـێکت بـۆ دروسـت دەبێت کاتێـک داوات لـــێ دەکرێـــت دوای ڕاســـتی و گەوهەری خـــۆت بکەویت.



هەر شتێک لە ڕۆژنامەدا بوترێت، بڕوای پێ دەکەیت، جا لێی تێبگەیت یان نا.

ئەهای پیاوە فیسقلەکە! تۆ تاکە بچووک نیت، دەزانم تۆ "ساتی مەزن" لەژیانتدا هەیە، ساتی "خۆشی" و "دڵخۆشبوون" و "بەرزبوونەوە." بەڵام تۆ خۆڕاگریت نییە تا بەرزتر و بەرزتر ببیتەوە و دڵخۆشییەکەت ببەیتە سەر و بەردەوام بیت. تۆ لە بەرزبوونەوە دەترسیت، لە بەرزایی و قووڵایی تۆقیویت. لەمەو پێش، نیتچە ئەمەی زۆر باشتر پێ وتوویت. بەڵام ئەوەی پێ نەوتیت کە بۆچی بەو جۆرەیت. هەوڵی داوە بتکات بە "سوپەرمان" و "مرۆڤێکی مەزن،" تا بتوانیت بەسەر مرۆڤەکەی ناختدا زاڵ ببیت. سوپەرمانەکەی ئەو بوو بە هیتلەری تۆ و، تۆیش هەر بە بچووکیی خۆت مایتەوە.



تۆ لە بەرزبوونەوە دەترسیت، لە بەرزایی و
قووڵایی تۆقیویت.

من دەمەوێت چیتر مرۆڤێکی بچووک نەبیت، دەمەوێت خۆت بیت. خۆت بیت نەک ئەو ڕۆژنامەیەی کە دەیخوێنیتەوە، یان ئەو بۆچوونە لاوازانەی کە لە دراوسێ بەدەکەتەوە دەیانبیستیت. دەزانم کە تۆ لەوە بێئاگایت کە لە ڕاستیدا ناخت چەندە قووڵە. لە قولاییدا وەکوو ئاسکێکیت، قووڵیت وەک خوداکەت و شاعیرەکەت و پیاوە ژیرەکەت. بەڵام بڕوات وایە کە ئەندامی کۆمەڵە سەربازانی دێرینیت، یان ئەندامی یانەی بۆڵینگ، یان ئەندامێکی کوکلوکس کلان. جا هەر لەبەر ئەوەی بڕوات وایە وەکوو ئەوانیت، ئەوەتا بەم شێوەیەی ئێستا هەڵسوکەوت دەکەیت. تۆ بەدرێژایی بیست و پێنج ساڵ ئەمەت لەلایەن هاینریش مانی ئەڵمانیایی و ئەپتۆن سینکلێری و دۆس پاسۆسی ئەمێریکایی و کەسانی ترەوە پێ وتراوە. بەڵام تۆ هاینریش مان و سینکلێرت نەدەناسی. تۆ تەنیا ئال کاپۆنێ و پاڵەوانی جیهانیی مشتەکۆڵە دەناسیت. ئەگەر بتخەنە بەردەم بژاردەی چوون بۆ کتێبخانە و شەڕە مشتەکۆڵەیەک، ئەوا بێگومان شەڕە مشتەکۆڵەکە هەڵدەبژێریت.

تۆ لەژیانتدا دەرۆزە بۆ خۆشبەختی دەکەیت، بەڵام پاراستنی خۆتت لە خۆشبەختی پێ گرنگترە، تەنانەت ئەگەر بڕبڕەی پشتت یان ژیانیشتی لەسەر دابنێیت. لەبەر ئەوەی هەرگیز فێری ئەوە نەبوویت خۆشبەختی بئافرێنیت، چێژی لێ ببینیت و پارێزگاریی لێ بکەیت، تۆ

نازانیــت ئــازایەتی و بــوێریی کەســایەتییەکی ڕاســت و خۆڕاگر چۆنە. ئاخر هەی پیاوی بچووک! تۆ دەتەوێت بزانیت کە خۆت چۆنیت؟




**تۆ لەژیانتدا دەرۆزە بۆ خۆشبەختی دەکەیت،**
**بەڵام پاراستنی خۆتت لە خۆشبەختی پێ**
**گرنگترە**

تـۆ لە ڕادیـۆ گـوێ بـۆ ڕیکلامـی فرۆشـتنی دەرمـانی ڕەوانـکەر و هەویـری ددان و لابردنـی بـۆنی نـاخۆش دەگریـت. بەڵام گـوێ لەو مۆسـیقایانە ناگریـت کە لەگەڵ ڕیکـلامەکەدا لێـدەدرێن. هەسـت بەقـوولایی بێبنـی گەمژەییەکەت و قێزەونیی ئەو شتانە ناکەیت کە بەرگوێت دەکەون و دەیانبیستیت. ئایا هەرگیز بە وردی تێبینیی ئەو گەپجـاڕەت[1] کـردووە کە لە ئـاهەنگی یـانە شـەوانەکاندا تیزخەندت[2] پێ دەکات؟ گاڵتە بە تۆ، خۆی و تەواوی ئەم جیهانە بێزارکەرە بچووکە دەکات. گوێ بۆ ئەو ڕیکلامە بگرە کە بۆ دەرمـانی ڕەوانـی دەکرێت، ئەو کات دەزانیت کە تۆ کێیت و چۆنیت؟

گوێ بگرە، پیـاوی بچـووک: ئەو کڵۆڵییەی لە بـوونی مرۆییـدا هەیە، بە هەر تـاوانێکی هیچوپـووچ کە دەیکەیـت، خۆی زیاتر دەنوێنێت. دانەبەدانەی کـارە هیچوپووچەکانت هیوای باشتربوونت زیاتر کاڵ دەکەنەوە. ئەمەش هۆکـاری خەمگینـی و دڵتەنگیتە، خەمێکی قـووڵ و دڵـتەزێن. پیـاوی بچـووک، بـۆ ئەوەی هەسـت بەو خەمگینـی و دڵتەنگیـیەت نەکەیت و بیرت بچێتەوە، چەندین گاڵتەی بچووکی خراپت

---

[1] گەپجاڕ: ئەو کەسەی گاڵتە بە خەڵکی دەکات و تیزیـان پێـوە دەنێت.

[2] تیزخەنـد: ڕابـواردن بە کەسـێک بـۆ ئەوەی خەڵـک پێـی پێبکەنن.

دۆزیـوەتەوە و نـاوت لێنـاون: "گـاڵتە و گەپی فۆلکلـۆری."
ئەو گـاڵتەیە دەبیسـتیت کە پێـت دەکرێـت و، لە قـووڵایی
دڵتەوە لەگەڵ کەسانی تردا پێدەکەنیت.



ئەو گاڵتەیە دەبیستیت کە پێت دەکرێت و، لە
قووڵایی دڵتەوە لەگەڵ کەسانی تردا
پێدەکەنیت.

تــۆ لەبەر ئەوە پێناکەنیــت کە خــۆت کــردووە بە گاڵتەچی. تۆ بە مێردەک پێدەکەنیت، بەڵام لەوە بێئاگایت کە بە خــودی خــۆت پێــدەکەنیت و، خەڵکیــیش بە تــۆ پێدەکەنن. ملیۆنان پیاوی بچووک نازانن کە خەڵکی بەوان پێدەکەنن. هـۆ پیـاوی گزگل! بـۆچی کەسـێک بە هێنـدە بە ڕاشــــکاوی و لە دڵەوە و بەو دڵخۆشــــییە کینــــاوییەوە چەندین سـەدەیە پێـت پێدەکەنێت؟ ئایا هەرگیز ئەوەت بە خەیاڵـدا نەهــاتووە کە لەو فیلمــانەی پێشـکەش دەکـرێن، "خەڵکـی" بـوونەتە مـایەی گـاڵتەپێکردن؟ مـن پێتـی دەڵـێم بۆچی کەسێک ئاوا پێت پێدەکەنێت، چونکە من گرنگییەکی زۆر زۆرت پێ دەدەم:

بەوپەڕی دڵنیــــاییەوە، بیرکــــردنەوەت هەمیشــــە حەقیـقەت ناپێکێت، ڕێـک وەک ئەو نیشـان شـکێنەی ڕێـک تەنیشــت خــاڵی پێکــانەکە دەپێکێــت. تــۆیش وا هەســت ناکەیـت؟ بـا بـۆتی ڕوون بـکەمەوە: تـۆ زۆر دەمێـک بـوو بوویـت بە گەورە و سـەرداری ژیـانی خـۆت، ئەگەر تەنیـا بیرکردنەوەت بە ئاڕاستەی حەقیقەتدا بڕۆشتایە. بەڵام تۆ بەم شێوەیە بیر دەکەیتەوە:

دەڵێـت: "هەمـووی خەتـای جوولەکەکـانە." دەپرسـم: "ئەرێ جوولەکە چییە؟" لە بەرسـڤمدا دەڵێت: "خەڵکانێک کە خـوێنی جـوولەکە لە لەشـیاندایە." لێـت دەپرسـمەوە: "جیاوازی لەنێوان خوێنی جوولەکە و خوێنی خەڵکی تـردا

چییە؟" ئەم پرسیارە هێدمانت[1] دەکات؛ نیگەران و بێهیوات دەکـــات و، لە وەڵامـــدا دەڵێـــت: "مەبەســـتم لە ڕەگەزی جـــوولەکەیە." لێـــت دەپرســـم: "ڕەگەز چیـــیە؟" دەڵێیـــت: "ڕەگەز؟ بۆچی؟ ئاسانە: هەر وەک چۆن ڕەگەزی ئەڵمانی هەیە، ئـــــاوایش ڕەگەزی جـــــوولەکەیش هەیە." لێــــت دەپرسـمەوە: "تایبەتمەنـدێتیی ڕەگەزی جـوولەکە چـۆنە؟" دەڵێیت: "جـوولەکە قژی ڕەشـە، لـوتێکی درێژی قولاپی و چـــاوێکی تیـــژی هەیە. جوولەکەکـــان بەرچـــاوتەنگن و خەریکـــی ســـەرمایەداری و پـــارە کـــۆکردنەوەن." دەڵـــێم: "باشە، ئایا هەرگیز پیاوێکی خەڵکی باشووری فەرەنسـا و پیـاوێکی ئیتاڵیاییـت پێکەوە لەگەڵ جوولەکەکەیـدا بینیـوە؟ دەتوانیـت لێکیـان جیـا بکەیـتەوە؟ " دەڵێیـت: "لەڕاسـتیدا نەخێر." دەپرسم: "ئەی کەواتە جوولەکە چییە؟ خوێن هیچ جیـــاوازییەک پیشـــان نـــادات و جـــوولەکەیەک هـــیچ جیـاوازییەکی لەگەڵ پیـاوێکی فەرەنسـی یـان ئیتاڵیـدا نییە. هەرگیز جوولەکەیەکی ئەڵمانیت بینیوە؟" ئێژیت: "بێگومـان، ڕێـک وەکـوو ئەڵمانییەکـان وان و لەوان دەچـن." دەڵـێم: "کـــورە ئەی ئەڵمـــانی چیـــیە؟" دەڵێیـــت: "ئەڵمانییەکـــان دەچـــنەوە ســـەر ڕەگەزی ئـــارییە ســـکەندەناڤییەکان." دەپرســـم: "ئایـا هنـدییەکانیش ســـەر بە ڕەگەزی ئـارین؟" دەڵێیت: "بەدڵنیـاییەوە." دەڵێم: "ئەی سـەر بە ڕەگەزەکانی

---

[1] هێدمان: متحیر

سکەندەناڤین.“ دەڵێیت: ”نەخێر.“ دەڵێم: ”ئەی قژ زەردن؟“ دەڵێیت: ”نا.“ پێت دەڵێم: ئەها نازانیت ئەڵمانییەک چییە و جوولەکەیەک چییە؟“ دەڵێیت: ”ئاخر جوولەکەکان هەن.“ دەڵـێم: ”دەی بەڵـێ، بێگومـان جوولەکەکـان هەن، هەر وەکوو چۆن مەسیحی و موسوڵمانەکان هەن.“ دەڵێیت: ”مەبەستم ئـۆلی[1] جـوولەکەیە.“ لێـت دەپرسـم: ”ئایـا ڕۆزڤێلت هۆڵەندی بوو؟“ دەڵێیت: ”نـا.“ دەپرسم: ”باشـە بۆچی تۆرەمەی[2] پێغەمبەر داوود بە جوولەکە ناو دەبەیت و، ڕۆزڤێلت بە هۆڵەندی ناو نابەیت؟“ دەڵێیت: ”ئاخر ئەمە سـەبارەت بەجوولەکەکـان جیـایە.“ دەپرسـم: ”دەی کـامە جیاوازییەکەیە؟“ دەڵێیت: ”نازانم.“

کـورە هەی مێـردەک! ئـاخر ئەمـانە فلتەفلتەکـانتن. بە بۆنەی ئەم هەڵیتوپەڵیتانەتەوە چەندین هێزی چەکدارییت دروستکرد کە بـوونە مـایەی قڕکردنـی ملیۆنـان مـرۆڤ بەس لەبەر ئەوەی ”جوولەکە“ بوون، تەنانەت نایشتوانیت بڵێیت جوولەکە چییە. ئاخر لەبەر ئەمەیە پێت پێدەکەنن، لەبەر ئەمەیە کەسـێک خـۆی لێـت دەپارێزێـت، کاتێـک خەریکـی کـارێکی گـرنگە، دەی هەر لەبەر ئەمەیە کە لەم زەلکاوەدا چەقیویت. کاتێک وشـەی جـوولەکە بە دەمتـدا دێت، خۆت بە باڵاتر دێتە بەرچاو. هەر دەبێت وابکەیت،

[1] ئۆل: ئایین

[2] تۆرەمە: زاتۆرە، نەوە و بنەچە

چونکە هەر بەڕاستی هەست بە چارەڕەشی دەکەیت. جا بۆیە هەست بە چارەڕەشی دەکەیت، چونکە تۆ خۆت لەناو ئەو کەسەدا دەکوژیت کە پێی دەوترێت جوولەکە. هۆ پیاوی بچووک! ئەمەیش تەنیا پاژێکی[1] زۆر بچووکی حەقیقەتە سەبارەت بە تۆ.

کاتێک بە لوتبەرزی و ڕسواکردنەوە کەسێک بە "جوولەکە" ناو دەبەیت، وا هەست دەکەیت بچووکییەکەت کەمتر دەبێتەوە. زۆر دەمێک نییە درکم بەمە کردووە. ئەگەر کەسێک کەمتر یان زیاتر لەوەی کە شایستەیە ڕێزت لێ بگرێت، بە جوولەکە ناوی دەبەیت. تۆ زۆردارانە، وەک ئەوەی نوێنەری هێزێکی ئاسمانی بیت، بڕیار دەدەیت کە کێ "جوولەکە"یە. بەڵام ئەی ئاریی بچووک یان هۆ جوولەکەی بچووک! من ئەو مافەت پێ ڕەوا نابینم. تەنیا خۆم، نەک هیچ کەسێکی تر لەم دونیایەدا، مافی ئەوەم هەیە بڕیار بدەم کە من کێم؟ من تێکەڵەیەکم لە هەردوو لایەنی بایۆلۆجی و فەرهەنگییەوە[2] و، شانازیش بەوە دەکەم کە لەڕووی هزری و جەستەییەوە دەرئەنجامی سەرجەم نەتەوە و ڕەگەز و چینەکانم، شانازی بەوەوە دەکەم کە مینا تۆ سەر بە

---

[1] پاژ: بەش، پارە

[2] لە هەر شوێنێکی ئەم وەرگێڕانەدا وشەی "فەرهەنگ"ت هاتە بەردەم، بە مانای "کلتوور" بەکار براوە.(هەڵەچن)

"ڕەگەزی پوخـت" و "چینـی پوخـت" نـیم، شـانازی دەکەم وەک تـۆ شـۆڤێنی نـیم، نە دەچمەوە سـەریان، وەکـوو تـۆ تیرەگەرخـــواز و شـــۆڤێنی نـــیم، هەی پیـــاوی بچـــووک فاشیستی ناو هەموو نەتەوە و چین و ڕەگەزەکان. بیستم کە لە فەلەسـتین پسـپۆڕێکی تەکنیکیـت نەویسـتووە لەبەر ئەوەی خەتەنە نەکرابـوو. من و جـوولەکەیەکی فاشیسـت هیچ شـتێکی هـاوبەش نییە لەنێوانمانـدا، وەک چۆن لەگەڵ فاشیستەکانی تریشدا وام. هیچ هەستێکم بۆ زمانی عیبری یان ئایینی جوولەکە یان فەرهەنگی جوولەکە نییە. باوەڕم بە خودای جـوولەکە نییە، هەروەهـا باوەڕیشـم بە خـودای مەسـیحایەتی و هینـدۆس نییە، بەڵام مـن ئاگـام لەوە هەیە کە لەکوێـوە خـوداکەت سـەرچاوەی گرتـووە. باوەڕیشـم بەوە نییە کە گەلی جوولەکە "تاکە گەلی خودا" یان "گەلی هەڵبژێردراو" بن.

بـاوەڕم وایە کە ڕۆژێـک لە ڕۆژان گەلـی جـوولەکە لەنێو کۆمەڵگەکـانی مرۆییەکـانی سـەر زەویـدا دەتوێتەوە، ئەمەیـش لە پێنـاو گەشـەی تیـابەتیی گەلەکە و گەشـەی نەوەکانیدا. هـۆ پیاوە جووە گزگلەکە! دەزانـم پێت خـۆش نیـــیە ئەم قســـانە ببیســـتیت، چـــونکە زۆر خـــۆت بە جوولەکەبوونتدا هەڵدەکێشیت، چونکە وەک جـوولەکەیەک خـۆت و هەمـوو ئەوانەی لە دەورتـن سـووک دەکەیـت. دوژمنی سەرەکیی جوولەکە، خودی جوولەکەکان خۆیانن، هەر بەو جـۆرەی پەنـدە کـۆنەکە وا دەڵێـت. بەڵام مـن

سـووکت نـاکەم و ڕقـم لێـت نـابێتەوە. هـیچ شـتێک نامبەسـتێتەوە بە تـۆوە، ئەوەی چینیـیەک و مشکەخۆرەیەکی[1] ئەمێریکایی پێکەوە کۆ دەکاتەوە: مـاکی[2] یەکەمییە کە گەردوونە. بۆچی ماکی خۆت هەر بۆ سـامی دەگێڕیتەوە و، نایگێڕیتەوە بۆ پرۆتۆپلازما، هەی جوولەکە گـزگلەکە؟ بەلای مـنەوە، ژیـان لە کرژبـوون و کشـانی پلازماوە دەست پێدەکات، نەک ئەوەی کە ئەحبارەکانی تـۆ دەیلێن.

چەندین ملیۆن سـاڵی خایاند تـا تـۆ لە شلەماسییەوە[3] پەرەت سـەند و بوویـت بەم دووپـێ زەمینیـیە. لادانـی بایۆلۆجییـانەت لە بـاری چەقبەسـتووییدا شـەش هەزار ساڵی خایاند. ڕەنگە سەد یان پێنجسـەد یان لەوانەیە پێنج هەزار سـاڵیش بخایەنێـت، تـا تـۆ سروشـتی خـۆت سـەرلەنوێ بـدۆزیتەوە، پـێش ئەوەی دیسـانەوە شلەماسییەکەی ناخت بدۆزیتەوە. من شلەماسییەکەی نێو نـاخی تـۆم دۆزیـیەوە و بە زمـانێکی ڕوون و ڕەوان بـۆم

---

[1] مشـکەخۆرە: گیـانەوەرێکە لە جـۆری مەمکـدارەکان و لە دەشـتتدا دەژی، بە ئینگلیـزی پێـی دەوترێـت: Weasel.(هەڵەچن)

[2] ماک: بنچینە، أصل

[3] شلەماسی: Jelly-fish، جەلییەماسی

ڕوون کـردیتەوە. کاتێـک یەکەم جـار لەبـارەیەوە شـتت بیست، تۆ منت بە بلیمەتێکی تـازە نـاوبرد. ئەگەر لەیـادت بێت لە سکەندەنافیا بـوو، لەو کـاتەی تۆ بەدوای لینینێکی نوێـدا دەگەڕایـت. بەڵام مـن کـاری گرنگتـرم هەبـوو، ئەو ڕۆڵەم ڕەتکردەوە و خۆمم پێوە خەریک نەکرد. هەروەهـا تـۆ بانگەشـەی ئەوەت کـرد کە مـن دارویـن، مـارکس، پاستۆر یا فرۆیدێکی نوێم. زۆر دەمێکە ئەوەم پێ وتوویت کە تۆش دەتوانیت وەکوو من بنووسیت و بئاخڤیت، ئەگەر دەست لە هاوارکردن هەڵبگریت. بەم هاوار کردنەت عەقڵ و بیـرت لەنـاو دەبەیـت و سروشـتی داهێـنەرانەت ئیفلـیج دەکەیت.

هۆ پیاوی بچووک! مەگەر ئەوە ئازاردان نییە کە ئەو دایکـانەی لە دەرەوەی پەیوەنـدیی ژنـومێردایەتی بـوونەتە دایک بە بەدڕەوشت ناویـان دەبەیت؟ مەگەر جیـاوازییەکی تونـد ناکەیـت لەنێـوان ئەو منـداڵانەی کە لە چوارچێـوەی خێزانـــدا لەدایـــک بـــوون، لەگەڵ منـــداڵانەی لە دەرەوەی پەیوەنـــدیی ژنومێردایەتیـــدا لەدایـــک بـــوون؟ ئۆهـــۆو بـوونەوەرە دامـاوەکە، تۆ لە قسـەکانی خۆیشت تێناگەیت. ڕێز لە مەسیحی منداڵ دەگریت کە لە دایکێک لەدایک بووە هـیچ گرێبەسـتێکی هاوسـەرگیریی نیـیە. بەم هۆیەشـەوە، ئەگەرچی هـیچ زانیارییەکیشت لەم بارەوە نییە، تۆ لەبەر ئـارەزووت بـۆ ئـازادیی سێکسـی ڕێـز لە مەسـیحی منـداڵ دەگریـــت، هەی پیـــاوی گزگـــل. تـــۆ، مەســـیحێک کە لە

دەرەوەی پەیوەنـــدیی ژنـــومێردایەتییەوە لەدایــک بـــووە، دەیکەیت بە کوڕی خوا، خوایەک کە پێی قبوڵ نییە هیچ منـدالێک لە دەرەوەی خێـزان لەدایـک ببێـت. بەڵام دواتـر وەکـــــوو پۆڵســــــی حەواری منــــــدالانی لەدایکبـــــووی خۆشەویســتیی ڕاســـتەقینە دەچەوســێنێتەوە و بە یاســـا ئایینییەکانـت منـدالانی نێـو ڕق و کیـنە دەپارێزیـت. ئەی هاوار تۆ چەند پیاوێکی کلۆڵی بچووکیت!



چەندین ملیۆن ساڵی خایاند تا تۆ لە شلەماسییەوە پەرەت سەند و بوویت بەم دووپێ زەمینییە.

تـــۆ ئۆتۆمبێـــل و شـــەمەندەفەرەکانت بەســـەر ئەو پـردانەدا دەپەڕێنیـتەوە کە گـالیلۆی مەزن دایهێنـاون. ئەی پیاوی بچـووک! ئەوە دەزانیت گالیلۆی مەزن سێ منداڵی هەبـووە، بـێ ئەوەی مـۆڵەتی هاوسـەرگیریی هەبێـت؟ تـۆ ئەمە بە خوێنـــدکارە منـــداڵەکانی خوێنـــدنگاکەت ناڵێیـــت. مەگەر تۆ هەر لەبەر ئەمە ئەشکەنجەی گالیلۆیشت نەدا؟





لادانی بایۆلۆجییانەت لە باری چەقبەستوویيدا
شەش هەزار ساڵی خایاند.

ئەی مێردەک! ئایا دەزانیت لە "نیشتمانی سلاڤییەکان"دا لینینــە مەزنەکەت، بــاوکە مەزنەکەی هەمــوو کرێکــارانی جیهان، ئەو دەمەی دەسەڵاتی گرتە دەست، هاوسەرگیریی زۆرەملێـی نەهێشــت؟ دەزانیــت خۆیشــی لەگەڵ ژنەکەیـدا دەژیـا، بـێ ئەوەی هـیچ مۆڵەتێکی هاوسـەرگیریی هەبێت؟ ئایا لەڕێی گەورەی هەموو سلاڤییەکانەوە دووبـارە یاسـا کۆنەکانی هاوسـەرگیریی زۆرەملێت جێبەجـێ نەکـردنەوە، هەر لەبەر ئەوەی کە نەتدەزانی دەبێت ڕێگە بدەیت کـارە مەزنەکەی لینین زیندوو بێت؟

تــۆ بە هــیچ شــێوەیەک نازانیــت ئەم شــتانە چــین: ڕاسـتی، مێـژوو، یـان خەبـات لە پێنـاو ئازادیتـدا و، ئینجـا نازانیت تۆ کێیت تا بیروبۆچوونی خۆتت هەبێت؟



جەنەڕاڵە کرێکارەکە

تــۆ بێئاگایــت لەو ڕاســتییەی کە نابەرپرســـیارێتیی سێکســی و ئەندێشــەی پــڕ وێــنەی ڕووتــی خــۆتن کە بە یاساکانی هاوسەرگیری و خێزانییەوە بەندیان کردوویت.

تــۆ هەســت بە بەدبەختــی و بچــووکی و بــۆگەنی و پەککەوتەیــی و شــەپلەبوونی[1] خــۆت دەکەیــت، هەســت دەکەیت ڕەق و تەق و نازیندوو و بۆشیت. هیچ ئافرەتێک نییە لەژیانتدا، ئەگەر هەیشبێت، تەنیا بۆ ئەوەیە "بیخەیتە ژێر خــۆت" تــا "پیــاوبوون"ی خــۆت بســەلمێنیت. تــۆ هەر نازانیــت خۆشەویســتی چیــیە؟ تــۆ قەبزیــت و دەرمــانی ڕەوانکەر وەردەگریت. بۆدرِنت[2] لێ دێت و پێستت شێدار و لیقە؛ هەست بە منداڵەکەت ناکەیــت لە باوەشتدا، بۆیە وەکوو توتکە سەگ تەماشایان دەکەیت تا بتوانیت لێیان بدەیت.

ترسـت لە لەدەسـتدانی توانـای "کـاژێربوون[3]" تەواوی ژیان و بیرکردنەوەی داگیرکردوویت. تێکەڵ بە کارەکەت بووە. هاوسەرەکەت جێی هێشتوویت، چونکە نەتتوانیوە خۆشەویســتیی پــێ بــدەیت. بە دەســت ترســێکی زۆر و

---

[1] شەپلە: نەخۆشیی ئیفلیجی

[2] بۆدرِن: بۆنی ناخۆشی لەش

[3] کـاژێر: ڕەحەتبـوونی پیـاو لە گـان. بە ڕەحەتبـوونی ژنــیش دەوترێت: زاوێر.

تـوورەیی و دڵەڕاوکێـوە دەناڵێنیـت. بیرکردنەوەکانـت بە دەوری حەزی سێکسـیدا دەسـوڕێنەوە. کەسـێک لەبـارەی ئابووریی سێکسییەوە قسـەت بۆ دەکات، لێت تێدەگات و دەیەوێت یارمەتیت بدات. دەیەوێت وات لێ بکات کە بە شەواندا لەگەڵ حەز و ئارەزووە سێکسییەکانتدا بژیت، بۆ ئەوەی بتوانیـت لە ڕۆژدا لە بیرکـردنەوە سێکسـییەکان ڕزگـارت ببێـت و توانیـت بە کارەکانـت ئەنجـام بـدەیت. دەیەوێت ژنەکەت بە ئاسـوودەیی لەباوەشتدا ببینێت، نەک نائومێد و پەشۆکاو. دەیەوێت منداڵەکانت گەشاوە بن نەک ژاکاو، خۆشەویسـت بن نەک تونـد و بەدڕەفتـار. بەڵام کە گوێـت لە باسـی ئـابووریی سێکسـی دەبێـت، دەڵێیـت: "سێکس هەموو شتێک نییە، شتی گرنگتر لە ژیانـدا هەیە." ئاخر هەی پیاوی بچووک! تۆ ئاواهایت.

یـان گریمـان تـۆ "مارکسـییەک" یـا "شۆڕشـگێڕێکی کـارامە" یـان "ڕابەری کرێکـارانی جیهانیـت" و، دەتەوێـت جیهـان لەو ئـازارانە ڕزگاربکەیـت کە بە دەسـتیانەوە دەناڵێنێت. خەڵـکە فێـڵ لێکراوەکـان لەدەسـتت هەڵـدێن و، تـۆش بەدوایانـدا ڕادەکەیـت، هاواردەکەیـت: "بوەسـتن، بوەسـتن ئەی گـرۆی کرێکـاران! ئێـوە نـابینن مـن ڕزگـارکەری ئێـوەم! بڕوخێـت سـەرمایەداری!" هـۆ شۆڕشگێڕی بچووکە! من قسە لەگەڵ ئەو خەڵکەدا دەکەم، بەدبەختییەکانی ژیـانە بچووکەکەیانیـان پێ نیشـان دەدەم. ئەوانیش بەوپەری پەرۆشـی و هیـواوە گـوێم بـۆ دەگـرن.

ئەو خەڵکە بە ئاپۆرا ڕوودەکەنە ڕێکخراوەکانت، چونکە پێشبینیی ئەوە دەکەن من لەوێ بدۆزنەوە. بەڵام ئەی تۆ چی دەکەیت؟ تەنیا دەڵێیت: "تام و چێژی سێکسی داهێنانی بورژوا بچووکەکانە. پشت بە هۆکارە ئابوورییەکان دەبەستێت." تۆش کتێبەکەی ڤان دی ڤێلدێ لەبارەی تەکنیکەکانی جووتبوونەوە دەخوێنیتەوە.

کاتێک پیاوێکی مەزن هەوڵی دا بنچینەیەکی زانستی بە ئازادبوونی ئابووریت ببەخشێت، هەژار و برسیت کرد. تۆ ئەو یەکەم هەوڵەت کوشت کە بۆ ئەوە درا ئە ڕاستییە هەڵبماڵێت کە تۆ لە یاساکانی ژیانلات داوە. کاتێک ئەم یەکەم هەوڵە سەری گرت، دەستت بەسەر بەڕێوەبردنیاندا گرت، بەم شێوەیەیش بۆ جاری دووەم کوشتتەوە. یەکەم جار ئەو پیاوە مەزنە ڕێکخراوەکەتی تواندەوە و لەناوی برد. دووەم جاریش خۆی مردبوو، بۆیە چیتر نەیتوانی بەرەنگارت ببێتەوە. تۆ لەوە تێناگەیت کە ئەو، لە کارەکەی تۆدا، ئەو هێزەی ژیانی دۆزیبووەوە کە بەهاکان دەئافرێنێت. لەوە تێناگەیت کە کۆمەڵناسییەکەی ئەو دەیویست کۆمەڵگاکەت لە دژی حوکوومەتەکەت بپارێزێت. خۆ تۆ لە هیچ شتێک تێناگەیت!

جا تەنانەت بە هۆکارە ئابوورییەکانتەوە بە هیچ جێگایەک ناگەیت. پیاوێکی مەزن و ژیر تا سەرەمەرگ کاری کرد، خەریک بوو ئەوەت پێ نیشان بدات کە ئەگەر دەتەوێت چێژ لە ژیان ببینیت، دەبێت تۆ بارودۆخە

ئابوورییەکان پەرە پێ بدەیت؛ دەیویست ئەوەت پێ نیشان بدات کە پیاوی برسی ناتوانێت پەرە بە فەرهەنگ بدات؛ کە هەموو بارودۆخەکانی ژیان بەبێ هەڵاواردن[1]، گرنگن؛ تۆ دەبێت خۆت و کۆمەڵگاکەت لەدەست هەموو ستەمکار و چەوسێنەرەکان ئازاد بکەیت. ئەم پیاوە مەزنە ڕاستەقینەیە تاکە هەڵەیەکی کرد، ئەویش کاتێک هەوڵی دا بەرچاوت ڕوون بکاتەوە: ئەو بڕوای بە توانای تۆ هەبوو بۆ ئازادبوونت. بڕوای بەوە هەبوو دەتوانیت ئەو ئازادییەی بەدەستت هێناوە، دەستی پێوە بگریت و بیپارێزیت. جگە لەوەیش هەڵەیەکی تریشی کرد: ئەویش ڕێی پێداویت تۆی "کرێکار" ببیت بە "دیکتاتۆر."

ئەی پیاوی کوڵەبنە! چیت لە سەرمایەی زانیاری و بیرۆکەکانی ئەو پیاوە مەزنە کرد؟ لە هەموو ئەو شتانەدا تەنیا یەک شت لە گوێیەکانتدا دەزرنگێتەوە: "دیکتاتۆرایەتی!" لە هەموو ئەو عەقڵە مەزن و دڵە گەورەیەی کە بۆتی کردیتەوە، تەنیا یەک وشەت لێ هێشتەوە و وەرتگرت، ئەویش: "دیکتاتۆرایەتی." هەموو شتەکانی تری وەک: ئازادی، حەقیقەت، ڕاشکاوی، چارەسەرکردنی کێشەکانی کۆیلایەتیی ئابووری، ڕێگا و شێوازەکانی بیرکردنەوەت وەلانان و بەداخەوە تەنیا یەک

[1] هەڵاواردن: استثناء

وشـەی پڕمانـا و خراپـت هێشـتەوە و پێـوەی نووسـای: "دیکتاتۆرایەتی!"

لەم کەمتەرخەمیـیە بچـووکەی پیـاوە مەزنەکەوە، سیسـتەمێکی زەبەلاحـت لە درۆ، چەوسـانەوە، ئەشـکەنجەدان، زینـدان، میـرغەزەب[1]، پۆلیسـی نهێنـی، سـیخوڕ، تاوانبـارکردن، یەکپۆشـی، ژمنەڕاڵ و مەدالیاکـان—بەڵام هەمـوو شـتەکانی تـرت وەلات نـان. پیاوی گرگن! ئێستا کەمێک باشتر تێدەگەیت کە تۆ چۆن کەسـێکیت؟ یـان هێشـتا نـا؟ زۆرباشـە، بـا دەسـت پـێ بکەیـنەوە: "بـارودۆخە ئابوورییەکـان"ی خۆشـی و خۆشەویسـتی لە ژیانتـدا گۆڕیـون بە شـتی بێمانـای میکانیکی؛ ئازادیی مرۆڤایەتیت گۆڕییەوە بە "باڵادەستیی دەوڵەت؛" ئامـادەیی قوربانیـدان لە پێنـاو نمـونەی بـاڵات گـۆڕییەوە بە "ڕێکخسـتنی حزبـی"ی کـوێرانە و گەمـژانە؛ تێکۆشان بۆ بەئاگاهێنانەوەی ملیۆنان کەست گۆڕییەوە بە نمایشـی پیشـاندانی بۆمـب هاوێژەکـان، ئـازادیی خۆشەویستیت گۆڕیەوە بە دەستدرێژیکردن و لاقەکردنی هەمـوو ئەو ژنـانەی دەسـتت کەوتـن، کاتێـک هـاتیتە بـۆ ئەڵمانیـا؛ لەنـاوبردنی هەژاریـت گـۆڕییەوە بە برسـیکردنی هەژار و لاواز و بێهیواکـان؛ چـاودێریکردنی منـداڵانت

[1] میـرغەزەب: جەلـلاد، کاربەدەسـتی حوکـوومەت بـۆ چەوساندنەوەی خەڵک.

گـۆڕییەوە بە "پەروەردەی نیشـتمانپەروەری؛" ڕێکخسـتنی منـداڵبوونت گـۆڕییەوە بە بەخشـینی مەدالیـای منـداڵبوون بەو دایکـانەی کە دە منـداڵیان دەبـوو. ئایـا هەرگیـز بە دەست ئەو بیرەتەوە نەتناڵاندووە، دایکێک و دە منداڵ؟

لە وڵاتانی تریشدا ئەم وشە بەدبەختە: "دیکتاتۆرییەت" لە گوێیەکانتـدا دەزرنگـایەوە. لەوێ جلـوبەرگی بـریقەداری نەرمـــت لەبەری کـــرد و ئەو فەرمـــانبەرە بچـــووک و نـاڕەحەت و نادیـار و خەمبـارەت خولقانـد تـا گەیانـدنیە: "ڕایخی سێیەم" و شەست ملیۆن کەسی هاوشێوەی تۆی لەگۆڕ نا. جا تۆیش هێشتا لە پیاهەڵدان و بژی بژی بۆی بەردەوامیت!

پیاوی بچووک، تۆ بەوشێوەیەیت! بەڵام هیچ کەسێک زاتی ئەوەی نییە پێت بڵێت کە تۆ چۆنیت. چونکە لێت دەترسێت و دەیەوێت هەر وا بە بچووکی بمێنیتەوە، پیاوی بچووک.

تۆ دڵخۆشیی خۆت لەناو دەبەیت. هەرگیز بە تەواوی ئـازادییەوە چێـژت لە خۆشـبەختی نەبینیـوە. هەر لەبەر ئەوەشـە چڵێسـانە بەختیاریت لەنـاو دەبەیت، بەبێ ئەوەی بەرپرسیارێتیی پاراستنی ئەو خۆشبەختییە بگریتە ئەستۆ. تـۆ ببـڕای[1] فێـری ئەوە نەبوویـت گرنگـی بە خۆشـبەختیت بـدەیت و چـاودێری بکەیـت، وەک چـۆن باخەوانێـک یـان

---

[1] ببڕای: هەرگیز

جووتیارێـک گرنگـی بە گـوڵ یـان بەروبومەکـانی دەدات، تــوێژەرە مەزنەکــان، شــاعیرەکان، زاناکــان لە دەســتت هەڵهاتن، چونکە ئەوان دەیانەوێت گرنگی بە بەختیـاری و خۆشـبەختیی خۆیـان بـدەن. پیـاوی بچـووک! لەگەڵ تـۆدا لەنــاوبردنی خۆشـــبەختی ئاســانە و پارێزگــاریلێکردنی ئەستەم و قورسە.

پیاوی فیسقل، ئایا نازانیت باسی چی دەکەم؟ با بۆتی باس بکەم: داهێنەرێـک بەبێ وچـان بۆ مـاوەی دە، بیسـت، سی ساڵێک بە هەتەر[1] لەسەر زانستەکەی کار دەکات، یان ئـامێرەکەی یـان بیـرۆکە کۆمەڵایەتییەکـان. ئەو دەبێـت بە تەنیـا قورسـایی بـاری ئەو کـارە نـوێیە هەڵبگرێـت. ئەو دەبێــت ئــازاری گەمژەیــی و کــارە ناڕاسـت و بیـرۆکە نابەجێکـانی تـۆ بچێژێـت، دەبێـت لێیـان تێبگـات و شـیيان بکـاتەوە و، دواجـاریش دەبێت بیـانگۆڕێتەوە بە کارەکـانی خــۆی، ئەی پیــاوی بچــووک. لە هەمــوو ئەمــانەدا تــۆ یـارمەتیی نادەیـت، نەک ئەوەش، بەڵکـو بەپێچەوانەیشــەوە تۆ یەیت تا پێی بڵێیت: "گـوێ بگـرە هـاوڕێم، دەبینم کە تـۆ چەنـد بە هەتەر کاردەکەیـت. درک بەوەیـش دەکەم کە تـۆ لەســەر ئــامێرەکەم، منــداڵەکەم، خێــزانەکەم، هــاوڕێکەم، خانووەکەم، کێڵگەکەم کاردەکەیت، تـاکو شـتەکان پەرە پێ بـدەیت و باشـتریان بکەیـت. زۆر لەمێـژە، مـن بەدەسـت

---

[1] هەتەر: جددی

ئەوانەوە ئازارم چەشتووە، بەلام من نەمتوانی یارمەتیی خۆم بدەم. ئێستا، ئایا دەتوانم یارمەتیت بدەم، تا یارمەتیم بدەیت؟“ نا، هۆ پیاوە گزگلەکە! تۆ هەرگیز بە پیریی یارمەتیدەرەکەتەوە ناچیت، تاکو یارمەتی بدەیت. تۆ یان هەر خەریکی یاری کاغەزیت، یان هاتوهاوار دەکەیت بۆ شەڕێک کە لەسەر پارە کراوە، یان خۆت لە نوسینگەیەک کۆیلە دەکەیت. بەلام هەرگیز دەستی یارمەتیت بۆ کەسی یارمەتیدەر درێژ نەکردووە. دەزانیت بۆچی؟ چونکە ئەو داهێنەرە جگە لە بیرۆکەکانی، هیچی تری نییە تاکو پێشکەشی بکات؛ نە قازانج، نە موچەی بەرز، نە جەژنی سەری ساڵ، نەبەخشیش، نە هیچ ڕێگەیەکی ئاسان بۆ ژیان. هەموو ئەوەی کە هەیەتی تا بیبەخشێت، تەنیا گرنگیپێدانە و، تۆیش هیچ گرنگیپێدانێکت ناوێت، تۆ زۆر زیاد لە پێویستت هەیە.



تۆ خۆشبەختییەکانی خۆت لەناو دەبەیت

بەڵام گەر تــۆ بەوشــێوەیە خــۆت بەدوور بگریــت، دەستی یارمەتی درێژ نەکەیت، ئەوا داهێنەرەکە سەبارەت بە تــۆ هەســت بە خەمبــاری ناکــات. دواجــار ئەو چیتــر لەجیاتی تۆ بیرناکاتەوە و نیگەران نابێت و داهێنان ناکات. ئەو هەموو ئەوانە دەکات، چونکە ئەرکی ژیانی پاڵی پێوە دەنێــت ئەوانە بکــات. نەک لەبەر تــۆ، بەزەیــی هــاتنەوە و گرنگیــدانیش بە تــۆ بــۆ ســەرۆکی حیزبەکــان و پیــاوانی کڵێســا جــێ دەهێڵێــت. ئەوەی ئەو ئــارەزوویەتی ببیینێــت ئەوەیە کە تۆ دواجار بتوانیت خۆت ئاگات لە خۆت بێت.

بەڵام تــۆ نەک بەوە ڕازی نیــت کە یــارمەتیی بــدەیت؛ بەڵکــو دەبیــتە ڕێگــر لە بەردەمیــدا و تفــی لــێ دەکەیــت. کاتێکیش داهێنەرەکە دوای کارێکی زۆر و خەریکبوون بە کــارەکەیەوە، بــۆ مــاوەیەکی زۆر لەوە تێدەگات کە تــۆ بــۆ ناتوانیــت ژنەکەت دڵخــۆش و ئاســوودە بکەیــت، دێیــت و دەڵێیــت: ئەو داهێــنەرە بەرازێکــی سێکســییە. بەڵام تــۆ بێئاگایــت لەو ڕاســتییەی کە بــۆیە وا دەڵێیــت، چــونکە لەســەرتە بەرازە سێکسییەکەی ناخــت کەبــت بکەیــت، هەر لەبەر ئەوەشــە ناتوانیت خۆشەویستی بکەیت. یان کاتێک داهێنەرەکە ئەوەی دۆزیــیەوە کە بــۆچی خەڵکی بەو ڕێژە زۆرە بە نەخۆشــیی شــێرپەنجە دەمــرن، ئەگەر تــۆ،ئەی پیــاوی بچــووک، بە ڕێــکەوت بوویــت بە پرۆفیســۆری "نەخۆشــیزانیی شــێرپەنجە" لەگەڵ هەبــوونی مــوچە و بژێــوییەکی بــاش، تــۆ دەڵێیت:ڕادەگەیەنیــت داهێــنەرەکە

ساختەچییە؛ یان دەڵێیت: ئەو هیچ شتێک سەبارەت بە بەکتریای ناو هەوا نازانێت؛ یان دەڵێیت: پارەیەکی زۆری خراوەتە بەردەست بۆ تویژینەوەکەی؛ یان دەپرسیت: ئاخۆ جوولەکەیە، یان خەڵکی ولاتێکی ترە و بیانییە؛ یان لەسەر ئەوە سوور دەبیت کە ئەو مافەت هەیە ئەو داهێنەرە تاقی بکەیتەوە، بۆ ئەوەی ئەوەت بۆ دەرکەوێت کە ئاخۆ توانای ئەوەی هەیە کار لەسەر کێشە و گیروگرفتەکانت لە چارەسەری شێرپەنجەدا بکات، ئەو کێشە و گرفتانەی کە تۆ ناتوانیت چارەسەریان بکەیت؛ یان تۆ ئەوەت پێ باشترە چەندین نەخۆش بە هۆی شێرپەنجەوە بمرن نەک ئەوەی دان بەوەدا بنێیت کە ئەو داهێنەرە ئەو شتەی دۆزیوەتەوە کە تۆ بۆ پاراستنی گیانی نەخۆشەکانت زۆر زۆر پێویستت پێیەتی. بۆ تۆ ئەو پلەوپایەیەی کە هەتە یان هەژماری بانکییەکەت یان پەیوەندیت لەگەڵ پیشەسازیی توخمی ڕادیۆم زۆر باشتر و گرنگترە لە حەقیقەت و فێربوون. ئاخر پیاوی بچووک! هەر لەبەر ئەمەیشە ئاوا بچووک و بەدبەختیت.

تۆ نەک تەنیا یارمەتیی نادەیت، بەڵکو بە ڕق و کینەوە بەری پێ دەگریت و دەبیتە ئاستەنگ لەبەردەم ئەو کارانەی کە ئەو داهێنەرە لەبری تۆ دەیانکات. ئێستا لەوە تێدەگەیت کە بۆچی بەخێرایی دڵخۆشی لەدەستت هەڵدێت؟ چونکە دڵخۆشی دەیەوێت کاری بۆ بکرێت و بە هەوڵ و ماندووبوون بەدەست بهێنرێت، بەڵام تۆ تەنیا

دەتەوێت دڵخۆشی لەناو ببەیت؛ ئەوە بۆیە لەدەستت هەڵدێت؛ ئاخر نایەوێت لەلایەن تۆوە لەناو ببرێت.

دوای ماوەیەک، ئەو داهێنەرە سەرکەوتوو دەبێت لە قایلکردنی خەڵکانێک بەوەی داهێنانەکەی لە بواری کرداریدا بەهای خۆی هەیە، با بڵێین ئەو داهێنەرە کارێکی کردووە کە شیاو بێت بۆ چارەسەرکردنی چەند نەخۆشییەکی دیاریکراو، یان بۆ بەرزکردنەوەی قورساییەک یان تەقاندنەوەی گابەردەکان، یان بۆ ئاشکراکردنی بەشەکانی ناوەوەی شتێک لەڕێی بەکارهێنانی تیشکەوە، بۆ ئەوەی ناوەوەی ببینرێت. تۆ بڕوای پێ ناکەیت، تا لە ڕۆژنامەیەکدا ئەو داهێنانە نەخوێنیتەوە، چونکە تۆ متمانەت بە هەستەکانی خۆت نییە. تۆ تەنیا ڕێز لەو کەسە دەگریت کە ترۆت دەکات و سوکایەتیت پێ دەکات، تۆ ڕقت لە خۆت دەبێتەوە، هەر لەبەر ئەمەیشە ناتوانیت متمانە بە هەستەکانت بکەیت، بەڵام کاتێک داهێنانەکەی ئەو داهێنەرە لە ڕۆژنامەکانەوە بڵاودەکرێتەوە، بە هەڵەداوان دێیت و بانگەشەی "بلیمەتیی" ئەو داهێنەرە دەکەیت، هەمان ئەو پیاوەی کە تا دوێنێ بە فریودەر و ساختەچی و بەرازی سێکسی و بە قۆڵبڕت دەزانی و بە پیاوێکی ترسناکت دەزانی کە زیان بە ڕەوشتی کۆمەڵایەتی دەگەیەنێت. ئێستایش کردووتە بە بلیمەت، تۆ نازانیت "بلیمەت" چییە؟ یان "جوولەکە" کێیە؟ یان "حەقیقەت" و "خشبەختی" چین؟

هـۆ پیـاوی گزگـل، مـن پێتـی دەڵـێم وەک ئەوەی "جـاک لەنـدەن" لە کتێبـی "مـارتن ئیـدن"دا پێـی وتوویـت. دەزانـم هەزاران جـار ئەو کتێـبەت خوێنـدووەتەوە، بەڵام لێــی نەگەیشــتوویت: "بلـیمەت" هێمــایەکی بازرگـانییە تـۆ لە بەرهەمەکـانتی دەیـدەیت، کاتێـک بـۆ فرۆشـتیان دادەنێیـت. ئەگەر ئەو داهێنەرە(ئەوەی تـا دوێنـێ بەرازێکی سێکسـی ، یان "شێتێک" بوو) بلیمەت بێت، ئەوا بـۆ تـۆ ئاسـانترە ئەو خۆشـبەختییە لەنـاو ببەیـت کە ئەو خسـتویەتیە دونیـاوە. چەنــدان پیــاوی بچــووکی هاوشــێوەی خــۆت پێکــڕا هــاواردەکەن: "بلـیمەت، بلـیمەت." خەڵکـیش بە قەتـارە[1] دەبەستن و دێن بەرهەمی نێو دەستەکانت دەخۆن. ئەگەر تۆ پزیشـک بیت، چەنـدان نەخـۆش ڕووت لـێ دەکەن؛ زۆر باشتر لە جارانی پێشووتر دەتوانیت یارمەتییـان بدەیت و، بەوەیـش پـارەیەکی زۆر تـر خـڕ بکەیـتەوە. تـۆیش ئەی پیاوی بچووک، دەڵێیت: "زۆر باشە، ئەوە هیچ خراپییەکی تێـدا نیـیە." بەڵام ئەوەی خـراپە، هـیچ پـارەیەک لە پێنـاو توێژینەوەیەکـدا بەکـار ناهێنیـت و گرنگیـی پـێ نادەیـت و تەنیا بەکاری دەهێنیت. ئێستایش ڕێک وا دەکەیت. تۆ هـیچ ناکەیـت کە داهێنـانەکە زیـاتر گەشـە بسـەنێت، بەڵکـو بە شــێوەیەکی میکانیکیــانە و چاوچنۆکــانە و گەمــژانەوە دەســتت بەســەردا گرتــووە. ســنوور و ئەگەرەکــانی

---

[1] قەتارە: ڕیز

تــوێژینەوەکە نابینێــت. ئــاوەزت درک بە ئەگەرەکــانی و ناتوانێــت بچێــتە ئەودیــو ســنووورەکانی. ئەگەر، وەکــوو پزیشکێک یان بەکتریاناسێک، بزانیت کە کۆلێرا و گرانەتا نەخۆشــیی درمــن[1]، ئەوا تــۆ لە نەخۆشــیی شــێرپەنجەدا بەدوای وردبینەزیندەوەردا[2] دەگەڕێیت، بەوەلاش چەندین دەیە بە تـوێژینەوەوە هەدەر دەدەیـت. جارێکیـان پیـاوێکی مەزن ئەوەی پی نیشـان دایت کە ئامێرەکان بەپێی چەنـد یاسایەکی دیاریکراو کاردەکەن؛ کەچی تۆ چەندین ئامێرت بـــۆ کوشـــتن دروســـتکردن و، لات وایە بـــوونەوەرە زینـدووەکانیش ئـامێرن. لەمەدا، هەڵەیەک دەکەیـت کە نەک سـێ دەیە، بەڵکـو سـێ سـەدەیش بەدەسـتیەوە دەناڵێنیـت؛ چەندین تێگەیشـتنی هەڵە لە سـەدان هەزار کاری زانسـتیدا لەنگەریان گرتووە؛ لەوەیش زیـاتر خـودی ژیـان بە خراپـی تێـک شـکاوە، بە هـۆی پلەوپـایە، ئـایین، هەژمـاری بـانکی، مامۆســـتا یـــان قەڵغـــانی کەســـایەتیەوە، ئەو کەســـانەت چەوساندوونەتەوە یان زیندانیت کردوون یان کوشـتوون کە ئاماژەیـان بەو ڕێیە ڕاسـتە کـردووە بەرەو زینـدوێتیی ناخی مرۆڤ دەڕوات.

---

[1] درم: تەشەنەکردوو، گوازراوە

[2] وردبینەزینـــدەوەر: Microorganism، ئەو زینـــدەوەرانەی بە وردبین دەبینرێن.



تۆ بلیمەتێکی باڵکراو و شیکپۆشت دەوێت، کە
بەبێ تەریقبوونەوە بتوانیت سەربەرزانە بەنێو
شەقامەکانی شارەکەتدا نمایشی بکەیت.

ڕاستییەکی حاشا هەڵنەگرە، دەتەوێت "بلیمەتان"ێک هەبن و ئاواتەخوازیشیت ڕێزیان لێ بگریت و بە شان و باڵیاندا هەڵبدەیت. بەڵام تۆ بلیمەتێکی باشت دەوێت، بلیمەتێکی لێهاتوو و میانڕەوت دەوێت، بلیمەتێکی گەوجت ناوێت، بەکورتی بلیمەتێکی باش پەروەردەکراو و گونجاو بێت، نەک یاخی و کەوی[1] نەکراو بێت و هەموو بەربەستەکان تێبپەڕێنێت. تۆ بلیمەتێکی سنووردار باڵکراو و شیکت دەوێت، کە بەبێ تەریقبوونەوە بتوانیت سەربەرزانە بەنێو شەقامەکانی شارەکەتدا نمایشی بکەیت.

هۆ پیاوی بچووک! تۆ هەر بەو جۆرەیت. تۆ زۆر باشیت لە ماشینەوە[2] و وەرگرتندا، بەڵام ناتوانیت بئافرێنیت. هەر لەبەر ئەمەیشە تۆ بەو جۆرەیت کە ئێستا هەیت، تەواوی ژیانت لە نوسینگەیەکی بێزارکەردا یان لەپشت مێزی دیزاینکردنەوەیت، یان لە بەرگی هاوسەرێتیدا بەندیت یان مامۆستایەکیت کە ڕقت لە منداڵەکانە. تۆ هیچ کات گەشە ناکەیت و بەرەو پێش ناچیت و هیچ هەلێکیشت نییە تا ببیت بە خاوەنی بیرۆکەی نوێ، چونکە تۆ تەنیا دەزانیت وەربگریت، هەمیشە شتی ئامادەکراو کە خەڵکی تر بۆی دانابوویت، بردووتن و هەڵتلوشیون.

---

[1] کەوی: دەستەمۆ،ماڵیکراو

[2] ماشینەوە: کۆکردنەوەی شتی پرش و بڵاو

تۆ نابینیت بۆ ئەمە بەم جۆرەیە، بۆچی ناتوانرێت جۆرێکی دیکە بێت؟ پیاوی گرگن، پێتی دەڵێم، چونکە من تۆ وەکوو ئاژەڵێکی ڕەق و تەق دەناسم، کاتێک ناخێکی بۆشەوە یان بە پەککەوتووییەوە یان نەخۆشیی مێشکییەوە بۆلای من دێیت. تۆ تەنیا دەتوانیت شتی خەڵکانی تر ببەیت و هەڵیلوشیت و، لە تواناتدا نییە ئافرێنەر بیت، یان کەسێک بیت ببەخشیت، چونکە بارە بنچینەییەکەی لەشت بریتییە لە ڕق و کینە و بەربەرەکانی؛ چونکە هەر کاتێک بزوتنی سەرەتایی خۆشەویستی و بەخشین لە جەستەتدا ئاخێز بدەن[1]، تووشی تۆقین دەبیت. وەرگرتنەکەت تەنیا یەک مانای هەیە: تۆ بەشێوەیەکی بەردەوام ناچاریت سکی خۆت سیخناخ بکەیت بە پارە و خۆشبەختی و زانیاری، چونکە هەمیشە هەست دەکەیت بۆش و لەبرسدامردوو و خەمگینی و، نە ئاگات لە زانیاری هەیە و نە وازیشت لێی هەیە[2]. پیاوی بچووک، لەبەر ئەم هۆکارەیشە تۆ بەردەوام لە حەقیقەت ڕادەکەیت. هەقیەقەت دەتوانێت تۆ لە دەست خۆشەویستیی ناخت ڕزگار بکات. بێ گومان دەتوانێت ئەوەت پیشان بدات کە من دەمەوێت لێرەدا بە

---

[1] ئاخێزبان: جووڵەیەکی کەمە وەک تەکانێک وایە

[2] وازلێبوون: ئارەزوولێبوون، پێخۆشبوون

تەکووزییەوە[1] پێتی پیشان بدەم. کەی هۆ پیاوە گزگڵەکە! تــۆ ئەمەت ناوێــت. تــۆ تەنیــا دەتەوێــت بەکــاربەر بیــت، دەتەوێت نیشتمانپەروەر بیت.

"گــوێ لەوە بگــرە! ئەو ملەجیڕێــی[2] نیشــتمانپەروەری دەکــات کە مەتەرێــزی[3] دەوڵەت و خــانە پێکهێنەرەکەیەتــی کە خێرانە! دەبێت شتێک لە دژی بکرێت!"

هەی پیاوی بچووک! تۆ بەو جۆرە دەقیرێنیت، کاتێک کەسێک لە قەبزییە دەروونییەکەت ئاگادارت دەکاتەوە. تۆ ناتەوێت گوێی لێ بگریت یان بیزانیت، تۆ دەتەوێت هــاوار بکەیت. زۆرباشە، بەڵام بۆ ڕێگە بە من نادەیت بە هێمنی ئەوەت پێ بڵێم کە بۆچی تۆ ناتوانیت خۆشبەخت بیت؟ تــرس لە چاوەکانتــدا بەدی دەکەم؛ وا دەردەکەوێــت ئەم پرســیارە لە نــاخەوە بتهەژێنێــت. تــۆ لەگەڵ "دڵفراوانیــی ئــایینی"دایــت، دەتەوێــت لە خۆشویســتنی ئۆلەکەتــدا[4] ئازادبیت. ئەمە کــارێکی زۆرباشــە، بەڵام تــۆ لەمە زیــاترت دەوێــت: دەتەوێــت ئــۆلەکەت تــاکە ئــۆل بێــت. دڵففراوانیــت بەرانــبەر بە ئــۆلەکەی خــۆت دەوێــت، بەڵام دڵفراوانــی

---

[1] تەکووز: ڕێکوپێک و بەتەرتیب

[2] ملەجیڕێ: ئینکاری

[3] مەتەرێز: سەنگەر، خەڵ، چەپەر

[4] ئۆل: ئایین

بەرانبەر بە ئۆلەکانی تر ڕەوا نابینیت. دەهەری دەبیت کاتێک کەسێک، لەبری خوایەکی تایبەت، سروشتی خۆش بوێت و بیەوێت لێی تێبگات. تۆ دەتەوێت ژن یان پیاو کاتێک ناتوانن چیتر پێکەوە هەڵبکەن، بە ڤڕی[1] بەدڕەوشتی، یان دڕندەیی، شکات لە یەکدی بکەن. تۆ بڕوات بە جیابوونەوەی هاوسەرەکان نییە کە لەسەر بنچینەی لێکتێگەیشتن و ڕێککەوتن دانراوە، تۆ لە ئارەزووەکانت تۆقیویت، تۆ حەقیقەتت لە ئاوێنەدا دەوێت، لەوێدا کە ناتوانیت بیگریت.

پیاوی بچووک! "دەمارگیریی نەتەوایەتی"ت ئەنجامی چەقبەستوویی جەستەیی و قەبزیی دەروونیتە. من ئەمەت وەکوو پێڕابواردن پێ ناڵێم، بەڵام لەبەر ئەوەی هاوڕێتم، هەرچەندە تۆ هاوڕێیەکانت سەر دەبڕیت و لەناویان دەبەیت، کاتێک ڕاستیت پێ دەڵێن. تەماشایەکی نیشتمانپەروەرەکانت بکە، ئەوان لەبری ئەوەی بە هێواشی ڕێ بکەن، مارش دەکەن. ئەوان ڕقیان لە دوژمن نییە، لەبری ئەوە "دوژمنی بۆماوەیی"یان هەیە، کە هەموو دە ساڵ جارێک دەیانگۆڕن، یان دەیانکەن بە هاوڕێی بۆماوەیی خۆیان و، دواتر دەیانکەنەوە بە دوژمنی بۆماوەیی. ئەوان گۆرانی ناڵێن، بەڵکو سرودی جەنگ

---

[1] ڤڕ: بوختان، درۆی هەڵبەستراو، درۆوەپاڵدان

دەچڕن. ئەوان ئامبازی ژنەکانیان نابن و ڕایاننامووسن[1]، بەڵکو سوواریان دەبن و ئەو "جارانە" دەژمێرن کە لە شەوێکدا سێکسیان لەگەڵدا کردوون. هەی پیاوی بچووک! تۆ ناتوانیت هیچ شتێک لە ڕاستییەکانم لەناو ببەیت و نکۆڵییان لێ بکەیت. تۆ تەنیا دەتوانیت بمکوژیت، هەروەک چۆن چەندین هاوڕێی ترت کوشتوون، مەسیح، ڕاتیناو، کارل لیبکنێخت، لینکۆڵن و چەندانی ترت کوشتوون. تۆ لە زمانی ئەڵمانیدا بەمە دەڵێیت: "پێپیانان." لەوسەری ڕێگەکەدا لەلایەن ملیۆنان کەسەوە تۆ پێت پێدا دەنرێت. بەڵام تۆ لە نیشتمانپەروەریی خۆت ناکەویت و بەردەوامیت.

تۆ ڕاکەڕاکتە بەدوای خۆشەویستییەوە، تۆ کارەکەی خۆتت خۆشدەوێت و بژێوی ژیانتی پێ پەیدا دەکەیت و، کارەکەیشت بە زانیارییەکانی من و کەسانی تر دەژی. خۆشەویستی، زانیاری و کار هیچ نیشتمانێک، هیچ تخووب[2] و هیچ جۆرە جل و بەرگێکی فەرمی ناناسن. ئەوان نێونەتەوەیین و بۆ تەواوی مرۆڤایەتین. بەڵام تۆ دەتەوێت نیشتمانپەروەرێکی بچووک و گرگن بیت، چونکە

---

[1] ئامبازبوون: یەکدی گووشین لە باوەشدا و دەستلەملانبوون.
ڕامووسان: ماچکردن بە ئەوینەوە

[2] تخووب: سنوور، کەوشەن

تــۆ لە خۆشەویســتیی ڕاســتەقینە تۆقیویــت، دەترســیت بەرپرســیاریێتیی کـارەکەت لەئەســتۆ بگریــت. لە زانســت و زانیــاری زەنــدەقت چــووە. لەبەر ئەمەیە تەنیــا دەتوانیــت خۆشەویستی و کار و زانیاریی کەسـانی تر بقۆزیتەوە و بــۆ مەبەســتی خــۆت بەکاریــان بهێنیــت، بەڵام هەرگیــز ناتوانیـت بۆ خـۆت شـتێک بئافرێنیـت. هەر لەبەر ئەوەیشـە بە شــەوان وەکوو دز خۆشبەختی دەدزیت؛ ئەوە بۆیە لە ئیرەییدا شین و مۆر دەبیتەوە و ناتوانیـت خۆشـبەختی لە کەسانی تردا ببینیت.

"ئەو دزە بگــرن، ئەوە غەوارە و پەنــابەرە. بەڵام مــن ئەڵمانیم، ئەمێریکاییم، دانیمارکیم، نەرویجیم!"



هەر لەبەر ئەوەیشە بە شەوان وەکوو دز
خۆشبەختی دەدزیت

کوڕە پیاوی کوڵەبنە! دەست ئەمە ڕابگرە. تۆ بۆ هەتاهەتایە پەنابەریت. بە هەڵکەوت هاتیتە ئەم دونیایە و ڕۆژێک دێت بە بێدەنگی جێی دەهێڵیت. دەقیڕێنیت؛ چونکە دەترسیت. هەست دەکەیت لەشت ڕەق و ورەدەوردە وشک دەبێت. لەبەر ئەمە دەترسیت و بانگی پۆلیسەکانت دەکەیت، بەڵام پۆلیسەکانت هیچ دەسەڵاتێکیان نییە تا بەسەر ڕاستییەکانی مندا زاڵ ببن. تەنانەت پۆلیسەکانت دێنە لای من، سکاڵا لە ژنەکانیان و منداڵە نەخۆشەکانیان دەکەن. ئەوان مرۆڤەکانی ناخیان بەوە دەشارنەوە کە جلوبەرگی فەرمی لەبەر بکەن، بەڵام ناتوانن لە منی بشارنەوە، چونکە چەندین جار بە ڕووتوقووتی بینیومن.

"ئایا ناوی لەلای پۆلیس تۆمارکراوە؟ پێناسەکەی هیچ ساختەییەکی تێدا نییە؟ ئایا باجی دەوڵەتی داوە؟ لێی بکۆڵنەوە، ئەو مەترسییە بۆ دەوڵەت و شکۆی نیشتمان!"



تۆ دەقیرێنیت، چونکە دەترسیت

بەڵـێ، پیـاوی بچـووک، بە تەواوی نـاو و ناونیشـانم تۆمـارکراوە، هـیچ غەل و غەشـێک لە پێناسـەکەمدا نیـیە، بەردەوام باجیشـم بە دەوڵەت داوە. ئەوەی تـۆی نـیگەران کـردووە، دەوڵەت و شـکۆی نەتەوە نیـیە، لەوە تۆقیویـت سروشـتت بـۆ خەڵکـی ئاشـکرا بـکەم، وەکـوو چـۆن لە نـۆرینگە پزیشـکییەکەمدا بینـیم. هەر لەبەر ئەوەیشـە تـۆ بەدوای ڕێگایەکـدا دەگەڕێـت، تـاکو بە تـاوانی سیاسـی تۆمەتبارم بکەیت و بۆ چەند ساڵێک بخرێمە زیندانەوە. پیاوی گرگن، من تۆ دەناسم. ئەگەر بە هەڵکەوت بوویت بە یاریدەدەری دادوەریی نـاوچەیەک، پاراستنی یاسـا یان هاوڵاتییانـت بەلاوە گرنـگ نابێـت؛ بەدوای دروسـتکردنی کێشـەیەکدا دەگەڕێـت، تـاکو پلەوپـایەت خێراتـر بەرز ببێـتەوە و ببیـت بە دادوەری نـاوچەکە. ئەمە هەمـان ئەو شـتەیە کە یاریـدەدەرە گرگنەکـانی دادوەریـی نـاوچەکە دەیانەوێت. هەمـان کاریشـیان بەرانبەر بە سـوکرات کـرد. بەڵام تۆ هەرگیز هیچ لە مێژووەوە فێرنەبوویت. سوکراتت کوشـت، بەڵام لەبەر ئەوەی هێشـتا بەو کـارەت نەزانیـوە، هێشـتا دەتەوێـت لەنـاو ئەو زەلکـاوەدا بمێنیـتەوە کە تـا بینەقاقـات هـاتووە. ڤـڕی[1] ئەوەت دایە پـاڵ سـوکرات کە زیـانی بە بەهـا جوانەکانـت گەیانـدووە. بەڵامـهەی پیـاوی بچووکی داماو! هێشتا ئەو بۆ ئەوان مایەی هەڕەشەیە. تۆ

[1] ڤڕ: بوختان، درۆی هەڵبەستراو، درۆوەپاڵدان

تەنیا جەستەیت کوشت، نەتتوانی بیرەکانی لەناو ببەیت. هێشتا بەردەوامیت لە کوشتن، بەڵام بەشێوەیەکی ترسنۆکانە و فێڵبازانە. تۆ ناتوانیت تەماشای ناو چاوم بکەیت، کاتێک بە ئاشکرا لەبەردەم خەڵکیدا ڤڕی بێڕەوشتیم دەدەیتە پاڵ. چونکە خۆت دەزانیت کاممان بێڕەوشت و بێئاکار و زەڤێریت[1]. جارێکیان کەسێک پێی وتیت: لەناو هەموو هاوڕێکانیدا تەنیا یەک کەس هەیە کە هیچ کات گوێم لێی نەبووە نوکتەی بێئابڕووانەی نەگێڕابێتەوە؛ ئەو کەسە من بووم. پیاوی بچووک، گەر ببیت بە دادوەری ناوچەیەک یان دادوەر یان بەڕێوەبەری پۆلیس، دەزانم نوکتە بێشەرمانەکانت چین، دەزانم لە کوێوە هەڵدەقوڵێن. جا باشترە بێدەنگ بیت. ڕەنگە بتوانیت ئەوەم پیشان بدەیت کە سەد دۆلار باجی کەمترم دابێت؛ یان لەگەڵ ژنێکدا بەسەر هێڵە کێشراوەکانی دەوڵەتدا تێپەڕیبم، یان بە میهرەبانییەوە لەسەر شەقامێک قسەم لەگەڵ منداڵێکدا کردبێت. بەڵام ئەوە تەنیا لە دەمی تۆدا ئەو سێ ڕستەیە ناخۆشن و بەد و بێبایەخن. لەبەر ئەوەی تۆ هیچی تر نازانیت، پێت وایە منیش مینا تۆم. نەخێر وانییە پیاوی بچووک، من وەک تۆ نیم و هەرگیزیش لەو شتانەدا وەک تۆ نابم. بەلامەوە گرنگ

---

[1] زەڤێر: ئارەزووی سێکسکردن

ئاخۆ نییە بڕوا دەکەیت یان نا. ئەوە ڕاستە کە تۆ دەمانچە و منیش زانیاریم هەیە. ئەرکەکان بەسەرماندا دابەشبوون.

هۆ پیاوی بچووک! تۆ ژیانی خۆت خاپوور کردووە، بەم شێوەیە:

- لەساڵی 1924 پێشنیاری توێژینەوەیەکی زانستیم کرد لەسەر کەسایەتیی مرۆڤ. بە پەرۆش و شەوقەوە بەرەو پیریی هاتیت.

- لەساڵی 1928 کارەکانمان یەکەم دەرئەنجامی دیار و هەستپێکراوی بەدەست هێنا، ئەو کاتیش بە پەرۆشییەوە بەرەو ڕووی هاتیت و بە "ڕێبەری ڕۆحی" ناوت بردم.

- لەساڵی 1933 ئەو توێژینەوە زانستییەم لە شێوەی کتێبێکدا بڵاوکردەوە، لە ڕێی چاپ و بڵاوکراوەی خۆتەوە. ئەو کات هیتلەر تازە دەسەڵاتی گرتبووە دەست. پێش ئەوەیش فێری ئەوە بووم لەو ڕاستییە تێبگەم کە بە هۆی ڕەقهەڵاتنی کەسایەتیی تۆوە دەسەڵاتی گرتە دەست. تۆ ڕازی نەبوویت کتێبەکەم لە خانەی چاپ و پەخشی تۆوە بڵاوببێتەوە، چونکە لە کتێبەکەدا ئەوەم نیشان دابوویت کە چۆن هیتلەرت بەرهەم هێنا.

لەگەڵ ئەوەیشدا کتێبەکە بڵاوبووەوە، تۆ هەر پەرۆش و بەجۆش بوویت بەرانبەری. بەڵام هەوڵتدا بە بێدەنگبوونت بیکوژیت، چونکە "سەرۆک"ەکەت دژایەتیی خۆی بەرانبەر ئەو کتێبە ڕاگەیاندبوو. هەروەها ئامۆژگاریی دایکەکانی کردبوو منداڵەکانیان لەسەر

کپکردنی جۆش و خرۆشە سێکسییەکان ڕابهێنن لەڕێی ڕاگرتنی هەناسەوە.

بە درێژاییی دوانزە ساڵ بێدەنگیت بەرانبەر بەو کتێبە هەڵبژارد، سەرباری ئەو پەرۆشی و جۆش و خرۆشەی بۆی هەتبوو. لە ساڵی 1940دا دووبارە کتێبەکە بڵاوکرایەوە بە ناوی "کلاسیک"ەوە کەوتیە پەسندانی. هێشتا هەمان پەرۆشیت بەرانبەر بە کتێبەکەم هەیە.

بیست و دوو ساڵی بێئارام و پڕ کارەسات تێپەڕی بەسەر ئەو کاتانەی کە من تێیدا ئەوەم فێرکردیت کە ئەوەی گرنگە چارەسەری نەخۆشییە دەروونییەکان نییە، بەڵکو ڕێگرتنە لە بڵاوبوونەوە و تەشەنەسەندنیان. بە درێژاییی بیست و دوو ساڵ من ئەوەم فێرکردیت کە خەڵکی بۆیە تووشی شێتی یان بیرکۆڵی و ناڵاندن دەبنەوە، چونکە ڕۆح و جەستەیان وشکهەڵاتوو و بەبەردبووە، نەدەتوانن خۆشەویستی ببەخشن و نەدەیشتوانن چێژی لێوە وەربگرن. چونکە ئەو کاتەی خۆشەویستی دەکەن، جەستەیان وەکوو بوونەوەرەکانی تر بە توانای کشان و چوونەوەیەکیان نییە.

دوای تێپەڕبوونی بیست و دوو ساڵ بەسەر قسەکانمدا، ئێستا دێیت و بە هاوڕێیەکانت دەڵێیت گرنگ چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکان نییە، بەڵکو ڕێگرتن لە تەشەنەسەندنیان و بڵاوبوونەوەیانە. هەمان

ئەو کـارانە ئەنجـام دەدەیـتەوە کە بە درێژاییـی هەزاران ســاڵ ئەنجامــت داون: ئامـــاژە بە ئامـــانجە گەورەکـــان دەدەیـــت، بـــێ ئەوەی شـــێوازەکانی گەیشـــتن پێیـــان بخەیتەڕوو. ئاماژە بە خۆشەویستیی ژیان لای کۆمەڵانی خەڵکـــی دەدەیـــت، دەتەوێـــت "ڕێگـــری لە نەخۆشـــییە دەروونییەکـان" بکەیـت. یـان دەڵێیـت: بێزیـان و بەڕێـزە. بەڵام خـۆت لە قەرەی بێتوانـایی سێکسـیی بـاو نادەیـت، تەنـانەت ناتەوێـت ناویشـــی بهێنیـت، بەبیـانووی ئەوەی قەدەغەیە. جـا وەک پزیشـکێک هەر لەنێـو ئەو زەلکـاوەدا گیر دەخۆیت و دەمێنیتەوە.

چـــۆن لە تەکنیککارێـــک دەڕوانیـــت کە تەکنیـــک و شـێوازەکانی فـڕین ئاشـکرا دەکـات، بەڵام ناتوانێـت نهێنـی مۆتـۆر و پەروانەکەیـت پـێ ڕابگەیەنێت؟ تـۆش ئاوەهایـت، وەک ئەو تەکنیککارانەی کە بە چارەسەرکردنی نەخۆشییە دەروونییەکـانەوە خەریکــن. تــۆ ترســنۆکیت، دەتەوێــت باشـــەکان هەڵبژێریـــت، گوڵــت دەوێــت، بەڵام ناتەوێــت دڕکەکانی بە دەستتدا بچن. ئایا چەندین گاڵتەی قیزەونت لەبارەی منەوە دروست نەکردووە و، بە"پەیامبەری باشتر کـاژێربوون/زاوێربوون[1]" نـاوت نەبـردووم؟ ئەی وانیـیە ئەی پسپۆڕی نەخۆشیی دەروونیی گرگن؟ ببڕای گوێت لە

---

[1] کاژێربوون: ڕەحەتبوون لە سێکس بۆ پیاو.

زاوێربوون: ڕەحەتبوون لە سێکس بۆ ژن.

سکاڵا و گازەندەی ئەو تازە بووکانە نەبووە کە لەلایەن پیاوەکانیانەوە توندوتیژی بەرانبەر جەستەیان کراوە کە بەدەست لەپیاوەتیکەوتنەوە دەناڵێنن؟ یان ناڵە و ئازاری ئەو گەنجانەت نەبیستووە کە خۆشەویستیی ناتەواویان تەقاندونیەتەوە؟ ئایا هێشتا ئاساییشی خۆتت لە نەخۆشەکانت پێ گرنگترە؟ تا چەندی تر تۆ شکۆ و پلەوپایەت دەخەیتە پێش پرسە پزیشکییەکانت؟ تا چەندی تر ئەو ڕاستییە پشتگوێ دەخەیت کە تاکتیکەکانت پەیوەستن بە ژیانی ملیۆنان کەسەوە؟

تۆ ئاساییشی خۆتت لە پێش حەقیقەتەوە داناوە، کاتێک لەبارەی "ئۆرگۆن"ەوە دەبیستیت کە من دۆزیومەتەوە، ناپرسیت: "دەتوانم چی بکەم؟ چۆن دەتوانێت نەخۆش چاک بکاتەوە؟" نەخێر، تۆ دەپرسیت: "ئایا مۆڵەتی پێدراوە لە ویلایەتی "ماین" خەریکی کاری پزیشکی ببێت؟" نازانیت کە مۆڵەتدانی تۆ هیچ سوودێکی نییە، جگە لە تۆزێک تێکدانی کارەکەم، بەڵام ناتوانیت ڕێگرم بیت لە ئەنجامدانی. تۆ بەوە نازانیت کە من لە هەموو شوێنێکی ئەم دونیایە نرخ و بەهای خۆمم هەیە، وەکوو دۆزەرەوەی تاعونی هەستەکان و، دۆزەرەوەی وزەی ژیان؛ ئەوەیش بزانە، کەسێک لە من زیاتر نەزانێت، ناتوانێت من تاقیبکاتەوە.

پیاوی گزگل، تا ئێستا هیچ کەسێک لێی نەپرسیویت: بۆچی نەتتوانیوە ئازادیی خۆت بەدەست بهێنیت، ئەگەر

بەدەستیشت هێنا، ئەوا دەستبەجێ ئازادییەکەتت ڕادەستی گەورەیەکی نوێ کردووە.

دەڵێیت: "گوێ لەمە بگرن! زاتی ئەوەی هەیە گومان لە شۆڕشی کرێکارانی جیهان بکات و لێی دوودڵ بێت، دەوێرێت گومان لە دیموکراسی بکات! لەناو بچن دوژمنانی شۆڕش، لەناو بچن!"

خۆت سەغڵەت مەکە ڕابەرە گورگنەکەی هەموو دیموکراتەکان و تەواوی کرێکارانی جیهان! بڕوام وایە سەربەستیی ڕاستەقینەی داهاتووت بە وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارەوە بەندە، نەک ئەو شێکارییانەی کە لە کۆنگرەی حیزبەکەتدا دەکرێن.

تۆ دەڵێیت: "با بمرێت! ئەو دەیەوێت شکۆی نەتەوە و پێشڕەوەکانی شۆڕشی کرێکاران بشێوێنێت، با بمرێت، پاڵی بدەن بە دیوارەوە و گوللەبارانی بکەن!"

پیاوی بچووک، بە قیرەقیڕی "بژی" و "بمرێ" یەک هەنگاویش ئامانجەکەت نزیکت ناکاتەوە. تۆ بڕوات وایە کاتێک ئازادیت پارێزراو دەبێت کە "خەڵکی لە پاڵ دیوارەکاندا بۆ گوللەبارانکردن ڕیز بکەیت." ئەگەر بۆ تەنیا جارێکیش بێت، لە بەرانبەر ئاوێنەدا بوەستە کە دەڵێت: "با بمرێت، با بمرێت!"

هەی پیاوی گزگل! بۆ ساتێک بوەستە. من نامەوێت سووکایەتیت پێ بکەم، تەنیا دەمەوێت ئەوەت پیشان بدەم

که بۆچی تا ئێستا نەتتوانیوە ئازاد ببیت، یان دەست بەو ئازادییەوە بگریت کە بەدەستت هێناوە؟ ئایا قەت ئەوەت بەلاوە گرنگ نەبووە؟



با بمرێت!

## "با بمرێت، با بمرێت، با بمرێت!"

زۆرباشــە، بــا بە کــورتی بــۆتی بگێــڕمەوە: مــن پێتــی دەڵــێم کە پیــاوە بچــووکەکەی ناخــت چــۆن هەڵســوکەوت دەکــات، ئەگەر هــاتوو لە بــارودۆخێکی ئــازاددا خــۆت بینیــیەوە. بــا وای دابنێــین تــۆ خوێنــدکاری لە پەیمانگــای لێکــۆڵینەوەی تەندروســتیی سێکســی لە منداڵان و لاوانــدا. تــۆ زۆر پەرۆشــیت بەرانــبەر بە "بیــرۆکە نایــابەکە" و دەتەوێت بەشداربیت. ئەمە ڕێک ئەوەیە کە لە دەزگاکەمدا ڕوو دەدات: خوێندکارەکانم لە ســەر مایکرۆسکۆبەکانیانن و لە گەردیلەپێکهێنەکــانی خــاک ورد دەبــنەوە. تــۆیش بە ڕووتوقــووتی لەنــاو کــۆکەرەوەی "ئــۆرگەن"ەکەدا دانیشــتوویت. بــانگم کردیــت تــا لەگەڵیــان لەو تاقیکردنەوەیەدا بەشداری بکەیت. بە ڕووتوقووتی بازت دا و خۆت خستە ناوەڕاستی کچ و ژنەکانەوە بۆ ئەوێ جەســتەتیان پیشــان بــدەیت. منــیش گەرمــاوگەرم سەرزەنشتم کردیت، بەڵام تۆ لەوە تێنەگەیشتیت کە من بــۆ وام کــرد؟ منــیش لەوە تێنەگەیشــتم کە بــۆچی تــۆ تێنەگەیشتیت. دواتر لە گفتوگۆیەکی بەرفراواندا وتت کە ئەوە تێگەیشتنی مـن بـووە بـۆ ئـازادی لە دەزگایەکدا کە گرنگی بە چەمکی تەندروستیی سێکسی دەدات. هەر زوو ڕق و کینەیەکی قووڵت بۆ پەیمانگاکە و بیرۆکە سەرەکی و بنچینەییەکــانی پەیــداکرد و هەر لەبەر ئەمەیشــە بەو شێوەیە هەڵسوکەوتت کردبوو.

نمـوونەیەکی تـر، بـۆ ئەوەی ئەوەت پیشـان بـدەم کە دووبارە و سـێبارە سەربەستبوونت بە لەدەست دەدەیت. تۆ دەزانیت و، منیش دەزانم و، هەموو کەسێکیش دەزانێت کە تـۆ بە شـێوەیەکی هەمیشـەیی لە بـارودۆخی برسـێتیی سێکسـیدایت؛ زۆر بە تـۆلازییەوە[1] تەماشـای ڕەگەزی بەرانـبەر دەکەیـت؛ لەگەڵ هاوڕێیەکانتـدا سـەبارەت بە خۆشەویستی بەشێوەی گاڵتەوگەپی بێئـابڕووانەوە قسـە دەکەیـت؛ بە کـورتی، تـۆ خەیـاڵێکی پـیس و زەنەکـانەت[2] بەرانبەر بە خۆشەویستی هەیە. شەوێکیان گوێم لێ بوو کە چـۆن خـۆت و هـاوڕێکەت لەو کـاتەی بە شـەقامەکەدا دەڕۆشـتن و پێکەوە هاوارتـان دەکرد: " کچمـان دەوێت! ئێمە کچمان دەوێت!"

سـەبارەت بە داهـاتووت، چەنـدین ڕێکخـراوم دامەزراندووە کە لەڕێیـانەوە باشـتر فێری ئەوە ببیـت لە ژیانـدا لە کلۆڵیت تێبگەیت و فریـای خـۆت بکەویت. تـۆ و هاوڕێکانت مێگەلئاسا دەهاتن بۆ ئەو کۆبوونەوانە. بۆچی پیاوی بچووک؟ لە سەرەتادا وام بیردەکردەوە کە بە هۆی دڵسـۆزی و ئـارەزووتەوەیە لە بەرەوپێشـچوونی ژیانتـدا. دواتر ئەوەم بۆ دەرکەوت کە چی هانت دەدات بەشداریی

---

[1] تۆلازی: حەزکردن لە ژنان، شەهوەتلەوەڕێنی

[2] زەنەکـانە: حەزی زۆر بـۆ سێکسـکردن(زەنەک: کەسـێ زۆر سێکس بکات.)

ئەو کۆبـوونەوانە بکەیـت. تـۆ پێـت وابـوو ئەو شـوێنە جۆرێکی نوێی جندەخانەیە[1] کە تیایدا دەتوانیت بە ئاسانی کچێکـت دەسـت بکەوێـت، بەبـێ ئەوەی هـیچ پـارەیەک سەرف بکەیت. هەر کە بەوەم زانی و لە نیازت تێگەیشتم، ئەو ڕێکخراوانەم لەناوبردن کە بۆ یارمەتیدانی ژیانی تۆ دامەزرابوون. نەک لەبەر ئەوەی پێم کارێکی خراپ بێت لە کۆبوونەوەکـانی ڕێکراوێکـدا کچێـک ببینیـت و بەدەسـتی بهێنیـت، بەڵکـو لەبەر ئەوەی بە مێشـکە پیسـەکەتەوە لێـی نزیـــک دەبـــوویتەوە. هەر لەبەر ئەم هۆکـــارەیش ئەو ڕێکخـــراوانەم داخســـتن و جـــارێکی تـــر لەو زەلکـــاوەدا مایتەوە کە تیایدا چەقیبوویت و سـەرت تێنابوو... ویستت شتێک بڵێیت؟

"بورژوازەکـان چینـی کرێکاریـان لەنـاو بـرد. ڕابەرانـی کرێکـاران دەبێـت لەسـەر ئەمە بێـنە دەنـگ و هاوکـاربن. دەبێـت ئەم پاشـاگەردانییە بە دەسـتێکی پـۆڵایین لەنـاو ببرێت. جگە لەمەیش، ئیدی کێشە سێکسییەکانی کرێکـاران خۆبەخۆ چارەسەر دەبن."

هـۆ پیـاوی گزگل! دەزانـم مەبەسـتت چییە. ڕێـک ئەو شـــتەیە کە ســـەرگەورەکانت لە نیشـــتمانی کرێکارانـــدا ئەنجامیـان دا: ڕێخۆشـکردن بـۆ کێشـە سێکسـییەکان، تـا کێشـــەکان خۆیـــان چارەســـەری خۆیـــان بـــکەن.

---

[1] جندەخانە: قەحبەخانە

دەرئەنجامەکەیشـــمان لەوەی بەرلـــین بینـــی، کاتێـــک سـەربازانی کرێکـاران بە درێژایـی شــەو دەسـتدرێژیی سێکسـیان دەکـردە سـەر ژنەکـان. تـۆیش ئەو ڕاسـتییە دەزانیـــت. پاڵەوانـــانی "ئـــابرووی شۆڕشـــگێڕانە"ت، "سـەربازانی کرێکـارانی جیهـان،" بـۆ چەنـد سـەدەیەکی تریش لە پیسییان هەڵکێشـاویت. ئایا تۆ دەڵێیت شێتگەلی ئـاوا "تەنیـا لە شـەڕدا ڕوودەدەن"؟ دەی مـن چیرۆکێکـی تری ڕاستەقینەت بۆ دەگێڕمەوە:



شەوانی بەرلین

یەکێک لەوانەی کە حەزی دەکرد ببێت بە ڕابەر، پڕ جۆش و خرۆش بوو بۆ دیکتاتۆرایەتیی پرۆلیتاریا، هەروەها سەبارەت بە ئابووریی سێکسییش زۆر پەرۆش بوو. هات بۆلام و وتی: "تۆ زۆر دڵفڕێنی. کارڵ مارکس ڕێی نیشانی خەڵکی دا چۆن دەتوانن لەڕووی ئابوورییەوە سەربەخۆ ببن. تۆیش ڕێگەت پیشانی خەڵکی داوە کە چۆن ئازادیی سێکسی بەدەست بهێنن: پێت وتوون: 'بڕۆن چەند حەزتان لێیە گان بن.' " لەسەری تۆدا، هەموو شتێک بووەتە لادان. ئەوەی من دەستلەملانی ئەویندارانە ناوی دەبەم، لە ژیانی تۆدا بووە بە چالاکییەکی زەنەکانە.

ئاخر هەی پیاوی گچکە! تەنانەت تۆ نازانیت من باسی چی دەکەم. ئەوە بۆیە جار لەدوای جار لە زەلکاوەکەدا دەچەقیت.

ئەگەر تۆ، هۆ ژنکۆک[1]! بە هەڵکەوت و بەبێ هەبوونی هیچ توانا و لێهاتووییەک بوویت بە مامۆستا، زۆر بە سادەیی دیارە هەر لەبەر ئەوەیە نەبوویت بە خاوەنی منداڵی خۆت، دەبێتە مایەی زیانی زۆر گەورە و لەباس نەهاتوو. ئەرکی تۆ پەروەردەکردنی منداڵە. لە پەروەردەکردندا، ئەگەر کەسێک بە هەتەرەوە دەستی بداتێ، مانای ئەوەیە بەشێوەیەکی ڕێکوپێک لایەنی

[1] ژنکۆک: ژنی گەمژە و ناتەواو

سێکسـیی منـداڵ ڕێـک بخەیـت. بـۆ ئەوەی ئەمەیـش بە ڕێکوپێکی بکرێت، پێویسـتە ئەو کەسـە ئەزمـوونی ئەوەی کردبێــت کە خۆشەویســـتی چیـــیە. بەڵام تـــۆ قەڵەو و ناپەسەند و سەرنجڕاکێش نیت. ئەوەیش بەسە کە وات لێ بکـات تـۆ ڕقت لە هەمـوو جـوان و دڵفڕێنێـک ببێـتەوە، تـۆ جەسـتەیەکی زینـدوو و نـاخێکی پـڕ لە ڕقـی تاڵـت هەیە. لەبەر ئەوە لۆمەت ناکەم کە قەڵەو و سـەرنجڕاکێش نیت، یــان لەبەر ئەوەی هــیچ کــات چێــژت لە خۆشەویســتی نەبینیوە، کە (پیاوێکی تەندروست تۆی خۆش ناوێت؛) یـان لە خۆشەویستیی منداڵ تێناگەیت. لەبەر ئەوە سـەرکۆنەت دەکەم، ئەگەر بــــۆت هەڵـــکەوت و لە خوێنـــدنگایەکی پێشـکەوتوودا بوویـت بە مامۆسـتا، بە هـۆی ناشـرینی و بێتوانـاییتەوە لە خۆشەویسـتیدا، ڕەوشـتێک دادەهێنیـت و، لەڕێـی ئەو ڕقە تــاڵەی کە هەتە دەســـت دەخەیــتە بینـــی خۆشەویستیی منداڵان و دەیخنکێنیت، دەی ئەمە تـاوان و کارێکی قێزەونە ژنـی بچووک. زیـانی بـوونی تۆ لەوەدایە منـــداڵانی تەندروســـت دەکەیـــت بە دوژمنـــی بـــاوکە تەندروســـتەکانیان؛ لە تێڕوانینـــی تـــۆوە خۆشەویســـتیی تەندروسـتی منـداڵان نیشـانەیەکی نەخۆشـیی دەرەکیـیە تیایاندا. بۆیە ئەمەیش دەکەیت چونکە لە بەرمیل دەچیت، وەکوو بەرمیـل بیـردەکەیتەوە، وەکـوو بەرمیـل پەروەردە دەکەیت، ناچیت بەبێ فیز لە قـوژبنێکی ژیانـدا دابنیشـیت، بەڵکو لەبری ئەوە لەپشت زەردەخەنەیەکی درۆ و ڕقاویی

تاڵەوە و بە شێوەی بەرمیلئاسا خۆت بەسـەر ئەم ژیـانەدا دەسەپێنیت.




وەکوو بەرمیل بیردەکەیتەوە، وەکوو بەرمیل
پەروەردە دەکەیت، ناچیت بەبێ فیز لە
قوژبنێکی ژیاندا دابنیشیت، بەڵکو لەبری ئەوە
لەپشت زەردەخەنەیەکی درۆ و ڕقاویی تاڵەوە
و بە شێوەی بەرمیلئاسا خۆت بەسەر ئەم
ژیانەدا دەسەپێنیت.

تۆیش پیاوی بچووک، لەبەر ئەوەی ڕێگەت داوە بەو جۆرە ژنانە تا هەڵسوکەوت لەگەڵ منداڵە تەندروستەکانتدا بکەن، ڕێگەت داوە تاڵی و ژەهریان بکەنە ڕۆحی بێگەردی ئەو منـدالانەوە، هەر ئەوەیـت کە هەیـت، هەر بەو جـۆرە بـژی کە دەژیـت، هەر وایـش بیـر بـکەرەوە کە بیـر دەکەیتەوە و، ئیدی ژیان هەر بەو جۆرە دەبێت کە هەیە.

دیسانەوە هۆ پیاوی گچکە! تۆ بەم شێوەیەیت: هاتیت بۆلام تا فێری ئەوە ببیت کە بە هەوڵێکی زۆر بەدەستم هێناوە و لە پێناویدا جەنگاوم. ئەگەر من نەبوومایە، ئەوا لە شـارۆچکەیەکی بچـووک یـان لادێیەکـدا پزیشـکێکی بچووک و بێ ناوبانگ دەبوویت. من زانیاری و شێوازی چارەسـەرکردنم فێرکردیـت. ئەوەم فێرکردیـت کە چـۆن ڕۆژانە خـولەک بە خـولەک سەربەسـتی لە ناختـدا سـیس دەبێت و، چـۆن تـۆوی کۆیلەبـوون گەشـە دەکات. دواتـر پـلەی بەرپرسـیارێتیی بـانگەوازی کارەکانمـت لە هەنـدێک وڵاتدا لەئەستۆ گرت. بە هەموو مانایەک ئازادبوویت لەم جیهانە. متمانەم بە دڵسـۆزیت هەبـوو. بەڵام لەبەر ئەوەی تۆ لەناخەوە هەستت کرد وابەستەیت بە منەوە و بەبێ من هیچت پێ ناکرێت، نەتتوانی لە خۆتدا پەرە بە خـۆت بـدەیت، تـۆ پێویسـتت بە مـنە تـا لە مـنەوە توانسـت و زانیـاری و متمـانەبەخۆبوون و تێـڕوانین بـۆ داهـاتوو و زیاتر لە هەموو شتێکیش بەرەوپێشچوون فێر ببیت. هـۆ پیـاوی بچـووک! منـیش بە خۆشـحاڵییەوە هەمـوو ئەو

شـتانەم پـێ دایـت. لە بەرانبەریشـیاندا داوای هـیچم لـێ نەکردیـت، بەڵام دواتـر ئەوەت ڕاگەیانـد کە مـن ناموسـتم ئەتک کردووە. بە بڕوابوون بە ئازادی، هەستت کرد نوێ بـوویتەتەوە، بەڵام تێکەڵکردنـی بەدڕەوشـتی و ئـازادی هەمیشـە نیشـانەی ناسـەرەوەی کۆیلەکـان بـووە. بە ئامـاژەکردن بە ئـازادییەکەت، ئەوەت ڕەتکـردەوە هـیچ ڕاپۆرتێکم سەبارەت بە کارەکەت بۆ بنێریت. تۆ هەست دەکەیـت ئازادیـت—ئـازاد لە هەمـوو کـارێکی هاوکـاری و بەرپرسیارێـتی. ئەی پیـاوی بچـووک! هەر لەبەر ئەمەشـە ئەوەیت کە هەیت و، هەر بۆیە جیهـانیش بەو جۆرەیە کە هەیە.

هـۆ پیـاوی بچـووک، ئایـا دەزانیت، هەستی هەڵۆیەک چـۆنە کاتێـک لەسـەر هـێلکەی مریشـکێک کڕدەکەێـت؟ لە سـەرەتادا هەڵـۆکە وا هەسـت دەکـات چەنـد بێچـووە هەڵۆیەک هەڵدێن و بەخێویـان دەکات، تـا ببن بە هەڵۆی گەورە. بەڵام دوای ترووکانـدنی هێلکەکـان دەبینێـت چەنـد جووجەڵەیەکی بچووکن. هەڵۆکەیش بەو هیـوا و ئاواتەوە دەمێنێتەوە کە دواجـار جووجەڵەکـان ببن بە هەڵۆ. بەڵام شـتی وا قەت ڕوونـادات، جووجەڵەکـان گەورە دەبـن و دەبـن بە مریشـکی گارەگـارکەر. کاتێـک هەڵـۆکە لەمە تێـدەگات، بە زۆر خـۆی دەگرێـت کە ئەو جـووجەڵە و مریشـکە گارەگـارکەرانە نەخـوات. تەنیـا شـتێک کە ڕێـی نادات بیانخوات، هیوایەکی بچووکە؛ ئەو هیـوایەی ڕۆژێـک

دێت لەنێوان ئەو جووجەڵە جووکە جووککەرانەدا بێچوە هەڵـۆیەک هەیە و گەورە دەبێـت و دەبێـت بە هەڵـۆیەکی گەورە، گەورە و بەتوانـا وەکـوو خـۆی تـا لە بەرزاییـیەوە تەماشای شوێنە دوورەکان بکات و، دونیا نوێیەکان، بیرە نوێیەکان و شێوازە نوێیەکانی ژیان بدۆزێتەوە. ئەمە ئەو تـۆزە هیـوایەیە کە ڕێگربـوو لەبەردەم هەڵـۆ خەمبـار و تەنیـاکەدا لە خـواردنی هەمـوو جـووجەڵە جـووکە جووککەرە و مریشکەکاندا. مریشکەکان ئەوەیان نەدەبینی کە هەڵـۆیەک لەسـەریان کڕکەوتـووە و تروکانـدوونی، ئەوەیان نەدەبینی لەسەر ئەو بەردە تیژ و بەرزانە دەژین؛ دوور لە دۆڵە تاریـک و شـێدارەکان. ئەوان وەک هەڵـۆ تەنیاکە تەماشـای شـوێنە دوورەکانیـان نەدەکرد بە تەنیـا، زۆر چڵێسانە ئەو شتانەیان هەڵدەلووشی کە هەڵۆکە بۆی دەهێنـان و، کاتێـک بـاوبۆران هەڵـی دەکـرد، خۆیـان دەخزانـدە ژێـر بـاڵە بەهێزەکـانی هەڵـۆکەوە. هەڵـۆکە بـێ ئەوەی هـیچ شـتێک هەبێت خـۆی پـێ بپارێزێت، بەرگەی دەگـرت، یـان ئەگەر بـارودۆخەکە خراپتربـووایە، بەردی بچووکی تیژیان پەیدا دەکرد دەیانگرتە هەڵۆکە؛ بۆئەوەی برینداری بکەن و ئازاری بدەن. کاتێک هەڵۆکە درکی بەم کـارە پـڕ ڕق و کیناوییەیـان کـرد، سـەرەتا ویسـتی ونجـڕ ونجڕیـان بکـات، بەڵام کە بیـری لـێ دەکـردنەوە، بەزەیـی پێیانـدا دەهـاتەوە. هەنـدێک جـار بەو هیـوایەوە بـوو لەنێـو

ئەو مریشـــکە گارەگـــارکەرە چڵـــێس و کورتبینـــانەدا هەڵۆیەکی بچووکی هاوشێوەی خۆی هەبێت.

تـا ئەمـڕۆیش ئەو هەڵـۆ تەنهـایە دەسـتبەرداری ئەو هیوایە نەبووە، بەردەوام بووە لەوەی جووجەڵەی بچووک هەڵبهێنێت.



جوجکه مریشکەکانی هەڵۆکە

پیاوی بچووک، تۆ ناتەوێت ببیت بە هەڵۆ و، هەر لەبەر ئەمەیشە داڵەکەرخۆرەکان دەتخۆن. تۆ لە هەڵۆڵەکان دەترسیت، بۆیە لەگەڵ ڕەوەی گەورەدا دەژیت و، هەر لەناو ئەوانیشدا دەخورێیت. هەندێک لە مریشکەکانت لەسەر هێلکەی داڵەکەرخۆرەکان کڕکەوتوون، داڵەکەرخۆرەکانیش لە دژی هەڵۆکان بوون بە ڕابەرت. ئەو هەڵۆیانەی دەیانویست بۆ شوێنێکی باشتر پێشەواییت بکەن. داڵەکەرخۆرەکان فێری ئەوەیان کردیت تا کەلاکی تۆپیو بخۆیت و بە چەند دەنکە گەنمێکی کەم ڕازی ببیت. سەرباری ئەمەیش، فێریان کردیت هاواربکەیت "بژی داڵەکەرخۆری مەزن!" ئێستا برسیتە و خەریکە دەمریت، هێشتا لە هەڵۆکان دەترسیت، ئەو هەڵۆیانەی لەسەر هێلکەی مریشکەکانت کڕکەوتوون.

هۆ پیاوی گزگل! ماڵەکەت، ژنەکەت، فەرهەنگت، شارستانەتت، زانست و تەکنیکت، خۆشەویستیت، پەروەردەی منداڵەکانت لە لم دروستکردوون. بە شێوەیەک شل و خۆنەگرە کە بەرگەی هیچ ناگرێت، نە خۆت بەمە دەزانیت، نە دەیشتەوێت پێی بزانیت و لێی بەئاگا بیت. ئەو پیاوە مەزنەیش لەناو دەبەیت و دەیکوژیت کە لەمە بەئاگات دەهێنێتەوە و پێتی دەڵێت. لە تەنگانە و ناخۆشیدا بەهەمان پرسیاری دووبارەوە دێیتەوە بۆ لام:

"منداڵەکەم لاسارە و هەموو شتێک دەشکێنێت، شەوان لە مۆتەکە دەترسێت، گوێ بە ئەرکەکانی خوێندنەکەی نادات، بەدەست قەبزییەوە دەناڵێنێت، ڕەنگی زەرد هەڵگەڕاوە، توندوتیژ و شەڕانییە. دەبێت چی بکەم؟ یارمەتیم بدە."

یان: "ژنەکەم سارد و سڕە، هیچ خۆشەویستییەکم پێ نابەخشێت. ئەشکەنجەم دەدات، بە هیستریاوە دەقیڕێنێت و شلگیرانە ڕەفتاردەکات، لەگەڵ چەندین پیاوی تردا دەستی تێکەڵکردووە، دەبێت چی بکەم؟ یارمەتیم بدە."

یان: "جەنگێکی نوێی ترسێنەر هەڵگیرساوە، دوای ئەوەی ئێمە لە دوا جەنگدا جەنگاین بۆ ئەوەی کۆتایی بە هەموو جەنگەکان بهێنین. دەبێت چی بکەین؟"

یان: "ئەو شارستانەتییەی زۆر شانازیی پێوە دەکەم، وا بەدەست هەڵئاوسانی ئابوورییەوە دادەڕمێت. ملیۆنان کەس هیچ نییە بیخۆن و لەبرسدا دەمرن، دەکوژرێن، دەزی دەکەن، گەندەڵ بوون و، هەموو هیوایەکیان لەدەست داوە. دەبێت چی بکەین؟"

"دەبێت چی بکەم؟ دەتوانرێت چی بکرێت؟" ئەمانە ئەو پرسیارە هەمیشەییانەن کە بە درێژایی سەدەکان دەیانکەیت.

چارەنووسی دەستکەوتە مەزنەکان، لەبەر ئەوەی لە ژیانێکدا لەدایک بوون کە حەقیقەت لە ئاساییش لەپێشتر دانراوە، بەم جۆرەیە: زۆر چلێسانە لەلایەن تۆوە هەڵلوشراون، تا دیسانەوە بیانکەیتەوە بە گوو.

چەندین پیاوی ئازا و تەنیا زۆر لەمێژە پێیان وتوویت چی بکەیت. دیسانەوە و دیسانەوە هەڤۆتەکانیانت[1] بە هەڵە وەرگرتووە، پارچە پارچەت کردوون و تێکت شکاندوون. هۆ پیاوی گرگن! هەمیشە بە هەڵە دەستت داونەتێ، لە ژیانتدا، لە مەسیحیبوونتدا، لە وتنەوەی سۆسیالیزم و دەسەلاتی سەروەری خەڵکدا، بگرە لەهەر شتێکی تردا کە دەستت داوەتێ، هەڵە بچووکەکانت لەبری حەقیقەتە مەزنەکان کردوون بە ڕێنوێنی[2] خۆت. دەپرسیت بۆچی وا دەکەم؟ بڕوا ناکەم پرسیارەکانت بەڕاست بێت، چونکە کاتێک گوێت لە حەقیقەتەکە دەبێت، دەبیت بە پیاوکوژ.

تۆ ماڵ و هەموو شەو شتانەی هەتن، زۆر شل و شێواو بونیاد ناون، چونکە ناتوانیت لەخۆتدا هەست بە ژیان بکەیت، چونکە خۆشەویستی لە منداڵەکانتدا لەناو دەبەیت، تەنانەت پێش ئەوەی لەدایک ببێت؛ چونکە

---

[1] هەڤۆت: فێرکاری، تعلیم

[2] ڕێنوێن: ڕێپیشاندەر

ناتوانیـــت بەرگەی هەر دەربڕینێکـــی زینـــدوو و، هەر جـوولەیەکی سروشـتی و ئـازادانە بگریـت. ناتوانیـت ددان بەخۆتـدا بگریـت و دەترسـیت و دەپرسـیت: "دەبێـت کـاک جۆنز و سمیسی دراوسێم چی بڵێن؟"



**ناتوانیت بەرگەی هەر دەربڕینێکی زیندوو و،**
**هەر جووڵەیەکی سروشتی و ئازادانە بگریت.**

پیاوی بچووک، ترسنۆکانە بیردەکەیتەوە، چونکە بیرکردنەوەی ڕاستەقینە بەندە بە هەستەکانی جەستەوە و، تۆیش لە جەستەی خۆت دەترسیت. چەندین پیاوی مەزن پێیان وتویت: "بگەڕێوە بۆ ماکی[1] خۆت—گوێ لە دەنگی ناخت بگرە—دوای هەستە ڕاستەقینەکانت بکەوە—ئاگاداری خۆشەویستی بە." بەڵام بەرانبەر بە قسەکانیان کەڕبوویت، توانای بیستنی ئەو جۆرە پەیڤانەت لەدەست دابوو. ئەم جۆرە قسانە لە بیابانە زۆر گەورەکاندا ون بوون و، هاوارکەرە تەنیاکانیش لە بیابانە تۆقێنەرە چۆڵەکەتدا لەناو دەچن.

پیاوی بچووک، لەنێوان بەرزبوونەوە و هەڵکشان بەرەو مرۆڤە گەورەکەی نیتچە و مرۆڤە کەمبەها و نزم و بێنرخەکەی هیتلەردا بژاردەت لەبەردەمدا بوو. بە ناوی هیتلەرەوە هاوارت کرد و مرۆڤە نزم و کەم بەها و لەژێربووەکەت هەڵبژارد.

لەنێوان دیموکراتییە ڕاستەکەی لینین و دیکتاتۆرایەتییەکەی ستالیندا بژاردەت لەبەردەمدا بوو، تۆ دیکتاتۆرایەتییەکەی ستالینت هەڵبژارد.

لەنێوان ڕوونکردنەوەکەی فرۆید بۆ سێکس کە ڕەهەندی سێکسیانەی نەخۆشییە ناخییەکەتی ڕوون

---

[1] ماک: ڕەسەن، بنچینە، ئەسڵ

دەکردەوە و بیردۆزەکەی لەبارەی سازانی فەرهەنگییەوە بژاردەت لەبەردەمدا بوو. کەچی تۆ تێڕوانینەکانی ئەوت لەبارەی کەلتوور و فەهەنگەوە هەڵبژارد، کە هیچ بوارێکت پێ نادەن تا لەسەریان بووەستیت. دید و بیردۆزەکانی ئەوت لەبارەی سێکسەوە پشتگوێ خستن.

لەنێوان سادەییە مەزن و پڕ شکۆکەی مەسیح و ئەو سەڵتی و بێژنییەی کە پۆڵس بەسەر قەشەکانیدا سەپاند بژاردەت لەبەردەمدا بوو. وەلێ تۆ ڕەبەنی و زۆرکردن بۆ ژیانی هاوسەریت هەڵبژارد. دایکە سادەکەی مەسیحت لەبیر کرد، دایکێک کە لە ئەوینەوە مەسیحی منداڵی هێنابووە دنیا.

لەنێوان بیرۆکەی مارکس بۆ هێزی کارکردنی زیندوو لە بەرهەمهێناندا، کە بە تەنیا بایەخی شتومەکەکان بەرهەم دەهێنێت و، لەلایەکی تریشەوە بیروباوەڕی ئەو سەبارەت بە دەوڵەت، بژاردەت لەبەردەمدا بوو. لێ تۆ دیدەکانی ئەوت سەبارەت بە دەوڵەت هەڵبژارد.

لە ماوەی شۆڕشی فەرەنسیدا لەنێوان رۆبسپێری دڕەندە و ستەمکار و دانتۆنی مەزندا سەرپشک بوویت. دەی تۆ ستەمکاریت هەڵبژارد و مەزنی و میهرەبانیت لەخاچ دا.

لە ئەڵمانیا لەنێوان بۆرین و هیتلەردا لەلایەک و لیبکنێخت و لانداو و بوهام لەلاکەی تردا سەرپشک

بوویت. وەلێ هیتلەرت کرد بە بەڕێوەبەری پۆلیس و، هاوڕێ ڕاستەقینەکانی خۆتت کوشتن و لەنێوان یۆلیۆس ستریچەر و دالتەر و ڕاتیناودا، ڕاتیناوت کوشت.

لەنێوان لۆدج و ویلسندا بژاردەت لەبەردەمدا بوو، ویلسنت کوشت.

لەنێوان دادگا خوێناوییەکانی پشکنین و ڕاستییەکانی گالیلۆدا سەرپشک بوویت. کەچی گالیلۆی مەزنت تا مردن ئەشکەنجەدا و سووکایەتیت پێ کرد، تا ئێستایش سوود لە دۆزینەوەکانی دەبینیت. تۆ لەم سەردەمەیشدا دیسانەوە بۆلای دادگاکانی پشکنین گەڕاویتەتەوە.

لەنێوان تێگەیشتن لە نەخۆشییە مێشکییەکان و چارەسەرکردن لە ڕێی تەزووی کارەباییەوە بژاردەت لەبەردەمدا بوو. تۆ چارەسەرت لە ڕێی تەزووی کارەباییەوە هەڵبژارد، بۆ ئەوەی درک بەو بەدبەختییە زۆر گەورەیە بکەیت کە تێی کەوتوویت، بۆ ئەوەی هەر بە کوێری بمێنیتەوە، لە کاتێکدا تەنیا چاوکراوەیی و بەرچاوڕوونی دەتوانێت یارمەتیدەرت بن.



کەسایەتییە ڕامیاریزان و دیپلۆماتەکانت

دەربکە

لەنێوان هیچ نەزانین سەبارەت بە خانە شێرپەنجەییەکان و ئاشکراکرنی نهێنییەکانی لەلایەن منەوە کە دەبووە مایەی پاراستنی گیانی ملیۆنان مرۆڤ، سەرپشک بوویت. تۆ بەردەوام بوویت لەسەر هەمان ئەو دەبەنگییەی سەبارەت بە شێرپەنجە لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بڵاو دەبوونەوە و بەرانبەر بە زانیارییەکان بێدەنگیت هەڵبژارد؛ ئەو زانیارییانەی کە لەوانە بوون منداڵەکەت یان ژنەکەت یان دایکتیان بپاراستایە.

هەی هیندیی بچووک! ملیۆنانت لێ دەمردن، لە برسدا دەناڵێنن، کەچی لەسەر قوربانیکردنی مانگا لە دژی موسوڵمانەکان دەجەنگیت. هۆو ئیتاڵیاییی گزگل! هۆو سلاڤییە تریستییە گرگنەکە! هیچ خەمێکی ترتان نییە جگە لەوە کە ئاخۆ تریست ئیتاڵیاییە یان سلاڤی. پێم وابوو تریست بەندەرێک بوو بۆ کەشتیەکانی گشت جیهان.

نازییەکانت هەڵواسی، دوای ئەوەی ملیۆنان کەسیان کوشت، چۆن بیرت دەکردەوە پێش ئەوەی ملیۆنان کەس بکوژن؟ ئاخۆ ئەو هەمووە جەندەکە[1] بەس نین بۆ ئەوەی بیربکەیتەوە؟ ئایا مردنی ملیۆنان کەست پێویستە بۆ ئەوەی هەستی مرۆڤایەتیت بجووڵێت؟

---

[1] جەندەک: تەرم

هەریەکێـــک لەم هـــیچ و پـــووچی و بێنرخییـــانەت، تیشـکێکی تـر دەخەنە سـەر ئەو بەدبەختییە ئـاژەڵییە زۆر گەورەیەی کە مرۆڤ پێوەی دەناڵێنێت. تۆ دەڵێیت: "بـۆچی هێنـــدە ئەمـــانەت بە گرنـــگ گرتـــووە؟ ئایـــا خـــۆت بە بەرپرسـیاری هەمـوو کـارێکی بەد و نەگبـرس دەزانیـت؟" لەگەڵ وتنـــی ئەمـــانەدا خـــۆت تاوانبـــار دەکەیـــت. پیـــاوی بچـووک، ئەگەر تـۆ لەنێو ملیۆنـان پیاوی بچـووکی تـردا، تەنیا تۆزێک لەو بەر پرسـیاریتییەت لە ئەستۆ بگرتـایە کە لەسەر شانتە، ئەوا دونیا بەشێوەیەکی جیاوازتر دەبوو و، هـاوڕێ مەزنەکانـت بە دەسـت هـیچ و پووچی و بێنرخیـی تۆوە نەدەمردن.

لەبەر ئەوەی تـۆ هـیچ بەرپرســیاریتییەک لەئەسـتۆ ناگریـت، مـاڵەکەت وەکـوو لـم شـل و شـێواو بنیـاد نـاوە و سەقفەکەی بەسـەرتدا دەڕووخێت، بەڵام تـۆ "شـکۆمەندیی کرێکـاران" و "نەتەوەیـی"ت هەیە. زەویەکەی ژێـر پێت وا هەرەس دەهێنێـــت، بەڵام هێشـــتا هـــاوار دەکەیـــت: "ســـەربەرزی و نەمـــری بـــۆ ڕابەری مەزن، بـــژی بـــۆ ئـابڕووی ئەڵمـانی، ڕووسـی و جـوولەکە!" بۆری ئاوەکـان دەشـکێنن و منـداڵەکەت دەخنکێـت، بەڵام بەردەوامیـت لە پارێزگـاریکردن لەو یاسـا و ڕێکوپێکییەی کە منـداڵەکانتی بە تێهەڵـــدان پـــێ پەروەردە دەکەیـــت. ژنەکەت بە هـــۆی کێشەی سییەکانیەوە کەوتووە جێ، بەڵام تۆ، هەی پیاوی

گـرگن! لەوە ڕادەمێنیـت ئـاخۆ بەردی بنـاغەی "فانتازیـای یەهودیی" چییە؟

بە هەڵداوان[1] خۆت دەگەیەنیتە لام و لێم دەپرسیت: "ئەی دکتۆری باش و ئازیز و مەزنم! چی بکەم؟ مـاڵەکەم وا دەڕمێـت، بـا لە هەمـوو شـوێنێکەوە دێـتە ژوورەوە، منـداڵەکەم، ژنەکەم، خۆیشـم نەخۆشـم، چـی بـکەم؟" وەڵامەکە ئەوەیە: مـاڵەکەت لە بەرد بنیـاد بنـێ. بەرد لە سروشتی خـۆتە، ئەو سروشـتەی لە خۆتـدا کوشـتت، ئەو خۆشەویسـتییەیە لە جەسـتەی منداڵەکەتـدا هەیە، خەونـی ژنەکەتە، هەر ئەو خەونـانەی خـۆتن کە لە تەمەنـی شـانزە سـاڵیدا هەتبـوون. سـاوێرەکانت[2] بە کەمێـک حەقـیقەت بگۆڕەوە. سیاسەتمەدار و دیبلۆماتکارەکانت دەربکە. ئەوە لەبیر بکە کە دراوسێکانت چی دەڵێن، گوێ لە ناخت بگرە؛ بەم کارەت دراوسێکانیشت سپاسگوزار و دڵخۆش دەبن. بە هاوڕێ کرێکارەکانت لە سەرانسـەری دونیا بڵێ کە تۆ لەمەودوا تەنیا بۆ ژیان کاردەکەیت، نەک بۆ مردن. لەبری ئەوەی بـۆ ئەو شـوێنە ڕابکەیـت کە میـرغەزەب و پیاوکوژەکانت خەڵکی تێدا دەکوژن، یاسایەک بۆ پاراستنی ژیـانی مرۆڤەکـان و شـتەکان دابنـێ. یاسـایەک کە ببێـتە بەردێـک لە بەردەکـانی بنـاغەی مـاڵەکەت. خۆشەویسـتیی

---

[1] هەڵداوان: ڕاکردن و هەناسەسواری

[2] ساوێر: وەهم

منداڵە بچووکەکانت لەدەست ژن و پیاوە مناڵبازەکان بپارێزە. ئەو قەیرە قسەهەڵبەستە وەدەر بنێ و ئاشکرای بکە و پەردەی لەسەر هەڵبماڵە، یان لە خوێندنگایەکی چاکسازی دایبنێ، لەبری ئەو گەنجانەی بە دوای خۆشەویستیدا وێڵن. چیتر هەوڵ مەدە بەسەر قۆرخکاریی قۆرخکارەکان و خوێنمژەکاندا ئاودیو ببیت، کاتێک لە پلەی ڕێبەریی کاردا دەبیت. پانتۆڵ و کڵاوە قوتەکەت فڕێ بدە و داوای مۆڵەت مەکە، بۆ ئەوەی ئامبازی ژنەکەت ببیت. پەیوەندی لەگەڵ خەڵکانی وڵاتانی تردا دروست بکە، چونکە ئەوانیش بە باش و خراپەوە وەکوو خۆتن. ڕێ بدە منداڵەکەت بە سروشتی خۆی گەشە بکات، بەو شێوەیەی خوا(یان "سروشت") ئافراندوویەتی. هەوڵ مەدە پەرە بە سروشتی بدەیت. لەبری ئەوە، هەوڵ بدە لێی تێبگەیت و بیپارێزیت. لەبری چوونت بۆ تەماشاکردنی ئەو یارییانەی لەسەر پارە دەکرێن، بچۆ بۆ کتێبخانە، لەجیاتی ئەوەی بچیت بۆ دوورگەی کۆنی[1]، گەشت بۆ وڵاتانی بیانی بکە. لە هەموو ئەمانە گرنگتر بە دروستی بیربکەوە، گوێ لە دەنگی ناخت بگرە، ژیانت لەنێو دەستەکانتدایە، متمانە بە هیچ کەسێکی تر مەکە، بەتایبەت ئەو ڕابەرەی کە هەڵتبژاردووە. خودی خۆت بە! چەندین پیاوی مەزن ئەوەیان پێ وتوویت.

---

[1] شوێنێکە لە شاری نیو یۆرک.(هەڵەچن)

دەڵێـت: "گـوێ لەم بـورژوا کۆنەپەرسـتە بچـووکە تـاکڕەوە بگرن! هـیچ شتێک لەبـارەی نەگۆڕیی مێژووەوە نازانێت، دەڵێت: 'خۆت بناسـە' ئەوە چ قسـەیەکی بێمانـای بورژواییـانەیە! کرێکـارانی شۆڕشـگێڕی دونیـا بە ڕابەرایەتی ڕابەرە خۆشەویستەکان، باوکی هەموو گەلان، بـاوکی هەمـوو ڕووسـەکان، بـاوکی هەمـوو سـلاڤییەکان، مرۆڤەکـان ئـازاد دەکـات! لەنـاو بچـن تـاکڕەو و ئاژاوەچییەکان!"

پیـاوی بچـووک، نەمریـی و تەمەنـدرێژی بـۆ بـاوکی هەمـوو گەلان و هەمـوو سـلاڤییەکان. گـوێ بگـرە پیـاوی بچووک! دەبێت هەندێک پێشبینیی هەتەر بکەم:

تـۆ دەسـەڵاتی بەڕێـوەبردنی تەواوی دونیـا دەگـریتە دەسـت و، هەر ئەمەیشـە وات لـێ دەکـات لە ترسـاندا بلەرزیت. بـۆ چەنـد سـەدەی داهـاتوویش، تـۆ هاوڕێکانـت دەکوژیـت، بە شـان و بـاڵی سـەروەرەکەت و ڕابەرانـی گشـت گەلان و ڕابەرانـی کرێکـاران و ڕووسـییەکاندا هەڵـدەدەیت. ڕۆژ لە دوای ڕۆژ، هەفـتە لە دوای هەفـتە، دەیە لە دوای دەیە، تـۆ ستاییشـی یەک لە دوای یەکـی سـەرگەورەکانت دەکەیـت؛ لەهەمـان کاتیشـدا گـوێ لە سـکاڵای منـداڵەکانت و بەدبەختیـی هەرزەکـاران و تامەزرۆیی پیاوان و ژنـان ناگریـت، یـان ئەگەر گوێشـیان لـێ بگریـت، ئەوا بە بورژوای تـاکڕەو ناویـان دەبەیـت. بـۆ چەنـد سـەدە، لەو شـوێنانەدا خـوێن دەڕێژیـت کە دەبێـت

ژیان تێیاندا پارێزراو بێت و، لەو بڕوایەدایت کە دەتوانیت لە ڕێی میرغەزەب و پیاوکوژەکانتەوە ئازادی بەدەست بهێنیت؛ بەم شێوەیە، بەردەوام خۆت لەو زەلکاوەدا دەبینیتەوە کە تێیدا چەقیویت. بۆ چەند سەدە، دوای کەسانی خۆهەڵکێش دەکەویت و کاتێک ژیان، ژیانی خۆت، بانگت دەکات، کەڕ و کوێر دەبیت. چونکە تۆ، پیاوی بچووک، لە ژیان دەترسیت، خەریکە زیرە دەکەیت. ژیانی خۆت لەناو دەبەیت و دەیکوژیت، بەو بڕوایەی کە گوایە لەو ڕێیەوە "سۆسیالیزم،" یان "دەوڵەت،" یان "شکۆمەندیی نەتەوەیی،" یان "پیرۆزیی خوا" دەپارێزیت.



تۆ لە ژیان دەترسیت

شتێک هەیە نە دەیزانێت و نە دەیشتەوێت بیزانێت: **خودی خۆت ئافرێنەری هەموو ئەو بەدبەختییانەی کە سات لەدوای سات، ڕۆژ لەدوای ڕۆژ بە دەستیانەوە دەناڵێنیت؛ ئەویش ئەوەیە کە لە منداڵەکانت تێناگەیت، پێش ئەوەی دەرفەتێکیان بۆ بڕەخسێت پەرە بە خۆیان بدەن، بڕبڕەی پشتیان دەشکێنیت و سەریان پێ نەوی دەکەیت؛ خۆشەویستی دەدزیت؛ چاوچنۆک و شێتی بەدەستهێنانی دەسەڵاتیت؛ بۆ ئەوەی پیشانیان بدەیت کە "سەرگەورە"یت، سەگ لەبەر دەرگاتدا ڕادەگریت.** بۆ چەند سەدە ڕێگاکەت ون دەکەیت، تا ئەو کاتەی تۆ و هاوشێوەکانت لەو بەدبەختی و کلۆڵییەی تێکەوتوون بە کۆمەڵ دەمرن و تێدا دەچن؛ تا ئەو کاتەی تۆقین لە بوونت لە تۆدا پریشک دەدات، لاوازی لەناو تۆدا چەخماخە دەدات. دواتر بەرەبەرە بە پەلەقاژێوە، فێری ئەوە دەبیت بەدوای هاوڕێکەتدا بگەڕێیت، ئەو هاوڕێیەی کە بەرهەمی خۆشەویستی و کار و زانیارییە، فێری ئەوە دەبیت لێی تێبگەیت و ڕێزی بگریت. هەنگینێ دەست بەوە دەکەیت کە تێبگەیت کتێبخانە بۆ ژیانی تۆ، زۆر گرنگترە لە چوونت بۆ تەماشاکردنی ئەو شەڕانەی لەسەر پارە دەکرێن؛ فێری ئەوە دەبیت پیاسەی نێو دارستان لە نمایشی سەربازی باشترە؛ چارەسەرکردن لە کوشتن باشترە؛ متمانەبەخۆکردنی تەندروستانە باشترە لە

وشیاریی نەتەوەیی و؛ خاکەڕایی[1] باشترە لە نیشتمان پەروەری و چەندان هاوار و غەڵبەغەڵبی تر.

تۆ بڕوات وایە ئامانج هۆکارەکان پاساو دەدات، نەمازە هۆکارە بەدەکانیش. لە هەڵەدایت: **ئامانج لەسەر هەمان ئەو ڕێگایەدایە کە دەیگریتەبەر. هەر هەنگاوێک کە ئەمڕۆ دەینێیت، ژیانی سبەینێتە.** ئامانجی مەزن بە کەرەستەی بەد و بێنرخ بەدەست نایەت. تۆ ئەمەت لە هەموو شۆڕشە کۆمەڵایەتییەکاندا سەلماندووە. گرتنەبەری ڕێگای بێنرخ و نامرۆڤانە بۆ گەیشتن بە ئامانجەکانت، بێنرخ و نامرۆڤت دەکەن و، نایشگەیت بە ئامانجەکەت.

دەپرسیت: "بەڵام چۆن بگەم بە ئامانجەکەم: خۆشەویستیی مەسیحییەت، یان سۆسیالیزم یان دەستووری ئەمێریکایی؟" خۆشەویستیت بۆ مەسیحییەت، سۆسیالیزم یان دەستووری ئەمێریکایی بەندە بەو کارانەی کە ڕۆژانە ئەنجامیان دەدەیت، ئەو شتانەی سات لە دوای سات بیریان لێ دەکەیتەوە، بەدە لەسەر ئەوەی چۆن هاوژینەکەت لەئامێز دەگریت، خۆشەویستیت بۆ منداڵەکەت دەردەبڕیت، چۆن لە کارەکەت دەڕوانیت لە ڕوانگەی ئەو بەرپرسیارێتییە کۆمەڵایەتییەی لە

---

[1] خاکەڕایی: بێفیزی

ئەســـتۆتدایە، چـــۆن خـــۆت دەپاریزیـــت لەوەی ببیـــت بە چەوسێنەری ژیانت.

بەڵام تـــۆ پیـــاوی بچـــووک! ئەو ئـــازادییەی لەلایەن دەســـتوورەوە پێـــت بەخشـــراوە، بە خراپـــی کەڵکـــی لـــێ وەردەگریـــت، لەبـــری ئەوەی ڕێـــگە بـــدەیت لە ژیـــانی ڕۆژانەتدا ڕەگ دابکوتێت، وەلایان دەنێیت و دەیانبەزێنیت.

تۆم بینی کە پەنابەرێکی ئەڵمانیی بوویت و، بە خراپ کەڵکت لە میوانداریی سویدییەکان وەردەگرت. لەو کاتەدا خـــۆت بە ڕابەری ســـەرجەم چەوســـاوەکانی ســـەر زەوی دەبینـــی. ئەو مێـــزەت لە یـــادە کە ســـویدییەکان خـــواردنی جۆراوجۆریـــان لەپـــێش ئـــێمەدا دانـــابوو؟ لەســـەر مێـــزەکە چەنـــدین خـــواردن بڵاوکرابـــوونەوە، بـــۆ ئەوە دانرابـــوون تـــا میوانەکان حەزیان لە کامیان بوو، دەستیان بۆ درێژ بکەن و بیخـــۆن. ئەم شـــتە بـــۆ تـــۆ شـــتێکی نـــوێ و نـــامۆ بـــوو، نەتـــدەتوانی لەوە تێبگەیـــت کە مـــرۆڤ چـــۆن متمـــانە بە لێهـــاتوویی مرۆڤـــانی تـــر بکـــات. بە تیـــزەوە[1] پێـــت وتـــم کە بەدرێژایی ڕۆژ هیچت نەخواردووە تا ئێوارە بە خـــواردنی خۆڕایی ورگت پڕ بکەیت.

دەڵێیـــت: "بە منـــداڵی برســـی بـــووم." دەزانـــم پیـــاوی بچووک، چونکە بە برسێتی بینیومیت و، دەزانـــم برســـێتی

---

[1] تیز: گاڵتەکردن

چییە. بەڵام تۆ بە دزینی خواردنی سەر مێزەکە ملیۆنان جار منداڵەکانت بە برسێتی دەهێڵیتەوە، ئەی ڕزگارکەری هەمـووان لە برسـێتی! هەنـدێک شـت هەن، مـرۆڤ لەو ماڵەی تیایدا میوانداری دەکرێت، نایانکات. لەوانە: دزینـی کەوچکی زیو، یان ژنی خانەخوێیەکە، یان دزینی خواردن لەسـەر ئەو مێزەی لەبەردەمیدا ڕازێنراوەتەوە. دوای ئەو کارەساتەی بەسەر ئەڵمانیادا هات، تۆم لە پارکێکدا بینیکە لە برسـاندا نیـوەمردوو بوویـت. پێـت وتـم: "یـارمەتیی سـوور"ی حیـزبەکەت ئەوەی ڕەت کـردووەتەوە کە کۆمەکیـت بکـات، چـونکە نەتوانیـوە ئەنـدامێتیی خـۆت لە حیزبـدا بسـەلمێنیت؛ بە هـۆی ئەوەی ناسـنامەی ئەنـدامێتییەکەت ون کردبوو. ڕابەرەکانت، ڕابەرانـی گشـت برسـییەکانی دونیـا، جیـاوازی دەکەن لەنێـوان مـرۆڤە برسییە سوور و سپی و ڕەشەکاندا. بەڵام ئێمە تەنیا یەک زینـدەوەری برسـی دەناسـین. تـۆ لە هەڵسـوکەوت لەگەڵ بچووکەکاندا بەم جۆرەیت.

بە هەمـان شـێوە لەگەڵ بـابەتە گەورەکانیشـدا بەم جۆرە هەڵسوکەوت دەکەیت:

تـۆ دەتەوێـت سـەردەمی چەوسـاندنەوەی سـەرمایەداری و بێڕێزیکـردن بە ژیـانی مرۆڤەکـان بسـڕیتەوە و دان بە مافەکانتـدا بنرێـت. سـەد سـاڵ لەمەوبەریـش بێڕێزیکـردن و سـووکایەتی بە ژیـانی مرۆڤەکـان هەبـوونە. بەڵام لەگەڵ ئەوەیشـدا ڕێـز لە

دەستکەوتە مەزنەکان گیراوە و، وەفاداری و بەئەمەکی بۆ کەسانی مژدەبەخشی کاری مەزن هەبووە و، دانیان ناوە بە کارامەییاندا. لە بەرانبەردا، ئەی تۆ چیت کردووە پیاوی بچووک؟

لەهەر شوێنێک تاج دەخەیتە سەری سەرگەورە بچووکەکانت، قۆستنەوەی هێزت زیاتر لەوەی سەد ساڵ لەمەوبەر تیژترە، زۆر دڕندانەتر قیز لە ژیانت دەکەیتەوە، لەگەڵ ئەوەشدا بە هیچ شێوەیەک ددان بە مافەکانتدا نانێیت. هەرچەندە زیاتر هەوڵ بدەیت تاج بخەیتە سەر سەرگەورەکانت و ڕێز لە دەستکەوتە مەزنەکان بگریت، هەمووی دەگۆڕیتەوە بە دزینی میوەی ڕەنجی هاوڕێ مەزنەکانت، کە بە هەوڵ و ماندووبونێکی زۆر بەرهەمیان هێناوە. تۆ نازانیت دانپێدانان بە کارامەیی و لێهاتوویی چییە؟ چونکە تۆ وا هەست دەکەیت چیتر وەکوو ئەمریکایی و ڕووسی و چینییەکان ئازا و ئازاد نابیت، ئەگەر شتەکان بناسیتەوە و ڕێزیان لێ بگریت. **ئەوەی دەتویست وێرانی بکەیت، ئێستا زیاتر لە هەموو کات دەدرەوشێتەوە و؛ ئەوەی دەتویست وەکوو ژیانی خۆت پارێزگاریی لێ بکەیت، وێرانت کردووە.** بەلای تۆوە دڵسۆزی "سۆزداری" یان "دابونەریتی بورژوا بچووکەکان"ە، ڕێزگرتنیش لە دەستەکەوتەکان زەلیلبوون و قاچماچکردنە. تۆ ئەوە نابینیت کە زەلیلیت و قاچ ماچ

دەکەیت، بێڕێز و پێ نەزانیت، لە کاتێکدا دەبوو دڵسۆز و بەئەمەک بیت.

تۆ لەسەر سەر وەستاویت و لەو بڕوایەدایت بۆ سەرزەمینی ئازادی سەما دەکەیت. تۆ لەو مۆتەکەیە بەئاگا دێیتەوە و دەبینیت چۆن بێ ئەوەی کەس یارمەتیت بدات و بەهاناتەوە بێت، لەسەر زەوی کەوتوویت، پیاوی بچووک. چونکە کاتێک پێت دەبەخشرێت، تۆ دەدزیت و، کاتێکیش دزیت لێ دەکرێت دەبەخشیت. تۆ مافی ئازادیی ڕادەربڕین و ڕەخنەگرتن لەگەڵ قسەی نابەرپرسیارانە و گاڵتەجاڕیدا تێکەڵ دەکەیت. دەتەوێت ڕەخنە بگریت، بەڵام ناتەوێت ڕەخنەت لێ بگیردرێت و، هەر لەبەر ئەم هۆکارەیشە، لەبەریەک هەڵوەشاویت. هەمیشە دەتەوێت هێرش ببەیت، بێ ئەوەی خۆت بۆ هێرشبردن ئاشکرا بکەیت. ئەوە بۆیە هەمیشە لە بۆسەدا دەکوژرێیت.

"پۆلیس، پۆلیس، ئایا پاسپۆرتەکەی ڕاستەقینەیە؟ ئایا بە ڕاستی دکتۆرە یان نا؟ ناوی تۆمارنەکراوە و، کۆمەڵەی پزیشکان دژایەتیی دەکەن."



پاسپۆرت (پاسەوانی سنوور)

هـۆ پیـاوی بچـووک، پۆلیسـەکان نـاتوانن یارمەتیـت بـدەن، ئەوان دەتـوانن دزەکـان بگـرن و هـاتوچۆ ڕێـک دەخەن، بەڵام ناتوانن ئازادیت بۆ فەراهەم بکەن. تۆ خۆت ئـــازادیی خۆتـــت لەنـــاو بـــردووە و، بێبەزەییـــانە بەردەوامیشیت لە لەناو بردنی. پێش جەنگی جیهانگرەوەی یەکەم، هـــیچ جـــۆرە گوزەرنـــامەیەک[1] بـــۆ گەشـــتە نێودەوڵەتییەکـان نەبـوو؛ دەتتـوانی بـۆ هەرکـوێیەک ئارەزووی بکەیت، گەشت بکەیت. جەنگ لەپێناوی "ئازادی و ئاشـتی"دا کـۆنترۆڵی گوزەرنـامەی دروسـتکرد و، مینـا ئەسپێ پێتەوە لکان. دوای جەنگی جیهانی یەکەم، کاتێک دەتەوێت گەشت بۆ 300 کیلۆمەتری ناو خاکی ئەورووپا بکەیـــت، ئەوا ســـەرەتا پێویســـتە داوای مـــۆڵەت لە کونسـولخانەی نەتەوە جیاوازەکـان بکەیـت. ئێسـتایش هەروایە، چەنـدین سـاڵ لە دوای کۆتاییهـاتنی جەنگـی جیهـــانگرەوەی دووەمـــیش هەروایە. دوای جەنگـــی جیهـانگرەوەی سـێیەم و ئەو دواجەنگەیشـی دوایـی بە گشت جەنگەکان دەهێنێت، هەروا دەمێنێتەوە.

"گوێ بگرن، ئەو سووکایەتی بە نیشتمانپەروەری و ئابڕوو و شکۆ و سەربەرزیی نەتەوەییم دەکات!"

ئاه پیاوی بچووک، بێدەنگ بە. ئاشکرایە دوو جۆر دەنگ هەن: لوورەی با لە دووندی چیاکاندا و، تڕ. دەی تۆ

---

[1] گوزەرنامە: پاسپۆرت

ترێت و، برِوایشت بە بۆنکردنی گوڵە وەنەوشە هەیە. من چارەسەری نەخۆشییە مێشکییەکانت دەکەم کە پێوەیان دەناڵێنیت و، کەچی تۆیش دەپرسیت ئاخۆ ناوم لە کوێ تۆماری پزیشکاندا هەیە یان نا؟ من لە شێرپەنجەکەت تێدەگەم، کەچی بەرێوەبەرە تەندروستییە بچووکەکەی تۆیش رێگری لە تاقیکردنەوە لەسەر مشک دەکات. پزیشکەکانتم فێرکردوون کە بەشێوەیەکی پزیشکییانە لێت تێبگەن و، کۆمەڵەی پزیشکەکانیشت پۆلیسم بۆ بانگ دەکەن و تاوانبارم دەکەن. تۆ مێشکت نەخۆشە، دکتۆرەکان چارەسەری شۆکی کارەباییان بۆ داناویت، وەک چۆن لە سەدەکانی ناوەراستدا زنجیر و قایشیان بەکار هێناوە بۆ چارەسەر.

کورە دەمت دابخە پیاوی گولانە[1]! تەواوی ژیانت کلۆڵییە. نامەوێت رزگارت بکەم، بەڵام دەمەوێت کۆتایی بە قسەکانم بهێنم، ئەگەر چی بە کراسی شەو و دەمامک و گوریسێک لەنێو دەستە خوێناوی و نابەکارەکانیشتەوە بێیت بۆ خنکاندنم. پیاوی گولانە، ناتوانیت بمخنکێنیت، تا خۆت لەگەڵمدا نەخنکێیت. چونکە من نوێنەرایەتیی ژیانت، هەستت بەرانبەر بە دونیا، مرۆڤایەتیت، خۆشەویستی و چێژی داهێنان و خولقاندنت دەکەم. نەخێر، ناتوانیت بمکوژیت، پیاوی گولانە، جارێک لە تۆ دەترسام، رێک

---

[1] گولانە: بچووک

پێش ئەوەی بڕوای زۆرم پێت هەبێت. بەڵام من زۆر پێش تۆم داوەتەوە و، ئێستایش هەزاران ساڵ لەمەوپێش و هەرزارن ساڵیش لەمەو پاشت دەبینم و لەبەر چاومە. دەمەوێت لە خۆت نەترسیت. دەمەوێت ئاسوودەتر و شکۆمەندانە بژیت. دەخوازم لەبری جەستەیەکی ڕەق و وشکهەڵاتوو، جەستەیەکی زیندووت هەبێت. گەرەکمە منداڵەکانت خۆشبوێن، نەک ڕقت لێیان بێت. دەمەوێت ژنەکەت دڵخۆش بکەیت، نەک ئەوەی ژیانی ژنومێردایەتی بۆ ئازار و ئەشکەنجەدانی بەکار بهێنیت. من پزیشکی تۆم، من ئەڵمانی یا جوولەکە یا مەسیحی یان ئیتاڵی نیم، من هاوڵاتییەکی سەر ئەم زەویەم. بەڵام بەلای تۆوە تەنیا ئەمێریکاییە فریشتەکان و یابانییە شەیتانەکان هەن.

"بیگرە، بیپشکنە! ئایا مۆڵەتی کاری پزیشکیی هەیە؟ فەرمانێکی شاهانە بڵاوبکەنەوە کە ئەو ناتوانێت بەبێ ڕەزامەندیی شای وڵاتە ئازادەکەمان، کاری پزیشکی بکات! ئەو لە کردار و ئارەزووە خۆشەکانم دەکۆڵێتەوە، زیندانیی بکەن! لەم وڵاتە بیتارێنن![1]"

---

[1] تاراندن: بۆ هەمیشە دەرکردن(بیتارێنن: بۆ هەمیشە دەریبکەن)


ئەوین دژ بە
یاسایە، گا...
ڕێگەپێدراوە

مـــن خـــودی خـــۆم ئەو مـــۆڵەتەم بە خـــۆم داوە بە کارەکـــانمەوە ســـەرقاڵ و بەردەوام بـــبم. هـــیچ کەســـێک ناتوانێـــت ئەو مـــۆڵەتەم پـــێ بـــدات. زانســـتێکی نـــوێم دۆزیـــوەتەوە کە دواجـــار مـــرۆڤ دەتوانێـت لە ڕێـیەوە لە ژیانت تێبگات. تۆ لە دەساڵ یـان لە سـەد سـاڵی داهـاتوودا بـــۆ خـــۆت ســـوودی لـــێ دەبینیـــت، هەروەک چـــۆن لە ڕابردوودا چڵێسـانە هەڤۆتەکانی ترمـت هەڵلووشـیون. هـۆ پیاوی گرگن! وەزیری تەندروسـتییەکەت هـیچ دەسـەڵاتێکی بەسەر مندا نییە.

پیاوی بچووک! ئەو تەنیا کاتێک دەتوانێت کاریگەریی هەبێت، ئەگەر زاتـی ئەوەی هەبێت ڕاسـتییە زانسـتییەکانم بخوێنێتەوە، بەڵام ئەو، ئەو زاتەی نییە. جا کە دەگەڕێتەوە بۆ وڵاتەکەی خۆی، بە خەڵکی دەڵێت کە من[1] لە یەکێک لە نەخۆشخانە دەروونییەکانی ئەمریکا بەندکراوم و، پیـاوێکی ئاسایی کردووە بە پشکنەری گشتی نەخۆشخانە، پیاوێک لە هەوڵێکـدا بـۆ نکـووڵیکردن لە چێـژی ژیـان، بیـردۆزە زانسـتییەکانی سـاختە کـرد. هـۆ پیـاوی بچـووک! منـیش لەلایەکـی تـرەوە ئەم وتـانە بـۆ تـۆ دەنووسـم. پیـاوی بچووک! ئایا بەڵگەی زیاترت دەوێت لەسەر بێدەسـەڵاتی و کەم توانایـیت؟ سـەرگەورە، پرۆفیسـۆرە، ڕێگەپێدراوەکانی

---

[1] ئەو مـــــنە بـــــۆ نووســـــەر دەگەڕێـــــتەوە نەک پیـــــاوی بچووک.(هەڵەچن)

تەندروستیت نـاتوانن ڕێـگە لە تێگەیشـتنی نەخۆشـیی "شـێرپەنجە" بگـرن. بە یـارمەتیی مایکرۆسـکۆپ لە دژی ڕێگـرییە ئاشـکراکانی ئەوان وەسـتاوم و لە کـارەکەم بەردەوام بـووم. چوونیـان بـۆ ئینگلـتەرا و فەڕەنسـا بـۆ بنکەنکـردن و زیانلێـدان لە کـارەکەم بێسـوود بـوو. وەک هەمیشـە لە هەمـان شـوێندا چەقی بوون کە تیایدا بـوون. منیش زیاد لە جارێک ژیانی خۆمم ڕزگار کردووە، پیاوی بچووک.

"کاتێـک سـەرگەورەکانی هەمـوو کرێکـارانی ئەڵمانیـا دەخەیـنە دەسـەڵات، دەبێـت ئەو بـۆ گوللەبـارانکردن بە دیـوارەوە پـاڵ بـدەینەوە! هەوڵ دەدات بڵێت کە کرێکـاران وەکـوو بورژوازەکـان نـاتوانن خۆشەویسـتی بـکەن. لە ڕێکخراوەکـانی گەنجانتـان دەکـات بە جنـدەخانە. پێـی وایە من ئاژەڵم! هۆشیاریی چینایەتیم دەشێوێنێت."

بەڵێ، ئەی پیاوی گزگل! مـن بتەکانت تێک دەشـکێنم کە هەسـتە باشـەکان و سەریشـتیان لەنـاو بـردوون. دەخوازیت ئاواتە مەزنە هەمیشـەییەکانت تەنیا لە ئاوێنەدا ببینیت، کە ناتوانیت بیانگریت و بەدەستیان بهێنیت. **بەڵام تەنیا دەستگرتنت بە ڕاستییەوە دەتکات بە گەورەی ئەم دونیایە.**

"لەم وڵاتە بیتـــارێنن! ئەو زیـــان بە ئـــارامی و یاســـا دەگەیەنێـــت، ئەو شـــۆفاری[1] دوژمـــنە هەمیشـــەییەکانمە. خانوویەکی بە پارەی مۆسکۆ یان بەرلین کڕیوە!"

تـــۆ تێناگەیـــت پیـــاوی بچـــووک. پیرەژنێکـــی بچـــووک هەبـــوو لە مشـــک دەترســـا. دراوســـێم بـــوو و زانیـــی لە ژێرزەمینـــی خانووەکەمـــدا مشـــک هەیە و تاقیکردنەوەیـــان لەسەر دەکەم. لەوە دەترسا مشک بەنێو قاچەکانیدا بچێت و بچێتە ژێر تەنوورەکەیەوە. ئەگەر بۆ جارێکیش تـام و چێژی خۆشەویستیی بکردایە، ئەوا ئەم ترسـەی نەدەبوو. بە هـۆی تاقیکردنەوەکـانمەوە لەســـەر مشـک، فێـری ئەوە بووم لە بۆگەنیی شێرپەنجەکەت تێبگەم، پیاوی بچووک. بە هەڵکەوت بوویت بە خـاوەنی ئەو خـانووەی کە تیایدام، ئەو پیـــرەژنە بچـــووکە دامـــاوە زۆری لـــێ کردیـــت لە خـــانووەکە دەرم بکەیـت. تـۆیش بەو هەمـوو بـوێری و ئازایەتی و ڕەوشـتەتەوە منت وەدەرنـا. منیش ناچـاربووم خـانوویەک بکـڕم تـا لە پێنـاو تـۆدا بەردەوام بـم لەسـەر تـاقیکردنەوە لە مشـکەکان و دووربـم لە تـۆ و ترسـنۆکیی تـۆ. پیـاوی بچـووک، دوای ئەوە تـۆ چیـت کـرد؟ وەک دادوەرێکی ناوچەیی بچووک کە ئاواتی پلەوپایەی بەرزە،

---

[1] شـۆفار: جاسـووس(لێرەدا بـۆیە وشـەی "سـیخوڕ" بەکـار نەهاتووە، چونکە سیخوڕ خۆی لە بنچینەدا ئـاژەڵە نەک پیشـە و سیفەت.)

ویستت پیاوە بەناوبانگە ترسناکەکە لەپێناو پیشەکەتدا بەکار بهێنیت. بە تۆمەتی ئەوەی ئەڵمانیایی بووم، یان وەکوو جارانی پێشووتر، بە شۆفاری ڕوسیا لە قەڵەمت دام. زیندانت کردم. لە دانیشتنی دادگادا بینیمیت کە چۆن لە شەرمدا سوور هەڵگەڕابوویت. خەفەتم بۆ خواردیت ئەی خزمەتکارە بچووکەکەی دەوڵەت. زۆر بەدبەختیت. شۆفارە نهێنییەکانیشت لەکاتی پشکنینی ماڵەکەمدا بۆ دەسکەوتنی "کەلوپەلی شۆفاری،" هیچ بە باشی باسی تۆیان نەدەکرد.

دواتـر، جـارێکی تـر تـۆم بینییەوە، ئەم جـارە وەک دادوەرێکـــــی بچـــووک لە بــــرۆنکس بە ئـــاواتێکی بەجێنەهێنـراوەوە بـۆ بەدەســتهێنانی پـلە و پۆسـتێکی بەرزتر. تۆمەتبارت کردم کە کتێبەکانی لینین و ترۆتزکی لە کتێبخانەکەمـدا هەن. پیـاوی بچـووک، تـۆ نازانیـت کتێبخانە بۆ چییە؟ پێم وتیت لە کتێبخانەکەمدا کتێبەکانی هیتلەر و بوودا و مەسیح و گۆتە و ناپلیۆن و کازانۆڤایش هەن. بـۆیە ئەمـانەم پـێ وتیـت بـۆ ئەوەی لە تـاعوونە هەسـتییەکان تێبگەیـت، مـرۆڤ دەبێـت لە هەمـوو دیـد و باوەڕەکـان بکـۆڵێتەوە، نەک تەنیـا لە یەک دیـد و بـاوەڕ بکـۆڵێتەوە، ئەمە بـۆ تـۆ شـتێکی نـوێ بـووە، دادوەری بچووک!

"بیگرن، زینـدانیی بکەن، ئەوە فاشیسـتە سـووکایەتی بە خەڵک دەکات."

تــۆ "خەڵــک" نییــت، هــۆ دادوەری بچــووک! تــۆ ســـووکایەتی بە خەڵــک دەکەیــت، چــونکە گرنگـــی بە دابینکردنـی مافەکانیـان نادەیـت، لەبـری ئەوە گرنگـی بە پیشـــەکەت دەدەیـت. بەدڵنیـاییەوە چەنـدین پیـاوی مەزن ئەمەیان پێ وتوویت، بەڵام هەرگیز گوێت بۆ نەگرتـوون، نەتخوێنـدوونەتەوە. مـن ڕێـز لە خەڵـک دەگـرم، چـونکە کاتێـک ڕاسـتییەکانیان پـێ ڕادەگەیەنـم، ژیـانم دەخەمە مەترسییەکی گەورە. دەمتوانی لەگەڵ تۆ یاریی کاغەز یـان گاڵتەوگەپم بکردایە. بەڵام لەسـەر هەمـان مێز لەگەڵ تۆدا

دانانیشم، چونکه تۆ پاڵپشت و پارێزەرێکی خراپی یاسا و مافی ئەمێریکاییەکانیت.

"ئەوە ترۆتسکییە! زیندانیی بکەن! ئەو سەگە سوورە خەڵکی هان دەدات!"

من خەڵکی هان نادەم، بەڵکو دەمەوێت متمانەبەخۆبوون و مرۆڤایەتیت هان بدەم و ڕابووەشێنم، کەچی تۆ بەرگەی ئەم کارەی من ناگریت. چونکە ئەوەی تۆ هەوڵی بۆ دەدەیت بەدەستهێنانی دەنگ و پلەوپایەی بەرزترە، دەتەوێت ببیت بە دادوەر لە دادگایەکی باڵاتر، یان ببیت بە ڕابەری هەموو کرێکاران. یەکسانی و شێوازی بیرکردنەوەی تۆ وەکوو ڕابەرێک گوریسێکن و لە گەردنی هەموو جیهان ئاڵاون. چیت لە ویڵسن کرد؛ ئەو مرۆڤە مەزن و دڵگەرمە؟ بەلای تۆوە دادوەرەکەی برۆنکس ویڵسن "خەیاڵپلاو"ێک بوو؛ بەلای تۆوە، ئەی ئەوەی خۆت بە ڕابەری کرێکارانی جیهان دەزانیت! ئەو "خەڵکدز" بوو. ئەی پیاوی بچووک! بە مەتەڵ و قسەی بەتاڵ و، ترست لە هیواکانت ئەوت کوشت.

خەریکە منیش دەکوژیت، پیاوی بچووک.

تاقیگەکەمت لەبیرە، دە ساڵ لەمەوبەر؟ ئەو کات تۆ یاریدەدەری تەکنیکی بوویت، بێکار بوویت و داوایان لێ کردم وەکوو سۆسیالیستێکی دیار و ئەندامی پارتێکی بەشداربوو بوویت لە حکومەت لەگەڵ مندا کار بکەیت.

مـــووچەیەکی بـــاش و بە ئـــازادیی تەواوت—بە مانـــای تەواوی وشەکە— هەبوو. لە هەموو بیروڕاگۆڕینەوەیەکدا بەشـــداریم پـێ دەکردیـت، چـونکە مـن بـڕوام بە تـۆ و "پەیام"ەکەت هەبوو. لەیادتە چی ڕوویدا؟ لە تاو ئازادیدا شاگەشـــکە بووبوویـــت، بـــۆ چەنـــد ڕۆژێـــک دەمبینیـــت قلیـانەکەت بە لالێـوەوە نـابوو و دەسـوڕایتەوە و هـیچ کارێکـت نەدەکـرد. لەوە تێنەدەگەیشـتم کە بـۆچی کـارت نەدەکـرد. بەیانیـان کە دەهـاتمە تـاقیگە، بـۆ ئەوەی ڕقـم هەڵسێنیت، چاوەڕێت دەکرد سـەرەتا من سـڵاوت لێبکەم. پیاوی بچووک، مـن حەز دەکەم لەپێشدا سڵاو لە خەڵکی بـکەم، بەڵام ئەگەر کەسـێک خـۆی بسـەپێنێت و چـاوەڕێ بکـات مـن سـەرەتا سـڵاوی لـێ بکەم، زۆر تـووڕە دەبـم، چـونکە بەدیـدی تـۆ مـن "گەورەتـر" و "بەڕێـوەبەر" بـووم. ڕێم پێ دایت بۆ چەند ڕۆژێک ئەو ئازادییە بە هەڵە بەکار بهێنیـت و، هەنگینـێ قسـەم لەگەڵ کردیـت. بە چـاوی پـڕ فرمێســـکەوە دانـــت بەوەدا نـــا کە نەتزانیـــوە چـــۆن هەڵسـووکەوت لەگەڵ ئەم ئـازادییەدا بکەیـت. پێشـــتر بە ئازادی ئاشنا نەبوویت، لە جێگاکەی پێشـووترتدا تەنانەت ڕێـگەی ئەوەت پـێ نەدراوە لەبەردەم گەورەکەتـدا جـگەرە بکێشـیت، تەنیـا ئەو کاتـانە بـۆت هەبـوو قسـە بکەیـت کە پرســـیارت لـــێ دەکـــرا، ئەی ڕابەری داهـــاتووی گشـــت کرێکاران! بەڵام لەلای من ئازادییەکی ڕاستەقینەت هەبوو، بەڵام بێئەدەبانە و ڕقهەڵسێنانە هەڵسوکەوتت کرد، کە لێت

تێگەیشتم لە کارەکەت دەرم نەکردیت. دواتر تۆ کارەکەت بە جێهێشت و چوویت باسی تاقیکردنەوەکانمت بۆ دەروونناسی دادگایەک کرد. تۆ زانیاریپێدەری نهێنی و یەکێک بوویت لە دووڕوو و پیلانگێڕەکان کە ڕۆژنامەکانت لە دژی من هان دەدا و کەمپینت بۆ ئەو مەبەستە ڕاگەیاند. پیاوی بچووک، کاتێک چێژ لە ئازادی دەبینیت، تۆ بەو جۆرە هەڵسوکەوت دەکەیت. هەوڵەکانت بۆ دژایەتیکردنم، نەک کارەکەی دوا نەخستم، بەڵکو دە ساڵ بردمیە پێشەوە.

هۆ پیاوی بچووک، بەو هۆیەوە جێت دەهێڵم. چیتر خزمەتت ناکەم و، نامەوێت بە هۆی بایەخپێدانتەوە تا مەرگ بە هێواشی ئازار بچێژم. تۆ ناتوانیت لەو ڕێگا دوورەی گرتوومەتە بەر، شوێنم بکەویت. دەتۆقیت ئەگەر تۆزێک ئاگاداری ئەوە بیت لە داهاتوودا چی چاوەڕێت دەکات. چونکە تۆ لەوەدایت دەسەڵاتی هەموو دونیا بگریتە دەست، تەنیاییم بەشێکە لە داهاتووی تۆ. بەڵام لە ئێستادا نامەوێت هاوڕێی گەشتەکەم بیت. وەک هاوڕێی گەشت تەنیا لە مەیخانەدا بێ زیانیت، نەک لەو شوێنەی کە من بۆی دەچم.

"بیکوژن! ئەو گاڵتە و سووکایەتی بەو شارستانەتییە دەکات کە منی 'پیاوی سەرشەقام' بنیادم ناوە. من مرۆڤێکی ئازادی ناو دیموکراتییەکی ئازادم. بژی!"

پیاوی بچووک، تۆ هەر هیچ نییت. ئەوە تۆ نییت کە ئەم شارستانەتییەت بنیاد ناوە، بەڵکو چەند سەردارێکی لێهاتوو و لێوەشاوەی کەم بنیادیان ناوە. تۆ هیچ بیرۆکەیەکت نییە کەچی بنیات بنێیت کاتێک بینا دەکەیت. کاتێک کەسێک پێت دەڵێت: "بەرپرسیارێتیی بنیادنان لەئەستۆ بگرە،" تۆ بە "ناپاکی پرۆلیتاریا" ناوی دەبەیت و بەرەو لای باوکی کرێکاران ڕادەکەیت کە هەرگیز ئەو واتت پێ ناڵێت.

پیاوی بچووک، تۆ ئازاد نییت، نازانیت ئازادی چییە؟ نازانیت ئازادانە بژییت. کێ بوو دەردە هەستییەکانی دەسەڵاتخوازیی گەیاندە ئەوروپا؟ تۆ پیاوی بچووک. ئەی لە ئەمێریکا کێ بوو؟ لات وایە ویلسن بوو.

"گوێ بگرن، منی تاوانبار کرد بە پیاوی بچووک! من کێم؟ چ دەسەڵاتێکم هەیە تا کاریگەری بخەمە سەر سەرۆکی نەتەوە یەکگرتووەکان؟ من ئەرکی خۆم جێبەجێ دەکەم، ئەوە دەکەم کە گەورەکەم فەرمانم پێ دەکات، خۆم لە سیاسەتی باڵا هەڵناقورتێنم."

کاتێک تۆ هەزاران ژن و پیاو و منداڵ بە ژووری گازەکان دەسپێریت، ئەوە دەکەیت کە پێت سپێردراوە، پیاوی بچووک، ئەی وانییە؟ زۆر بێزیانیت کاتێک تەنانەت نازانیت چی ڕوو دەدات. تۆ شەیتانێکی داماویت کە هیچت نییە بۆ وتن، کە هیچ بیروڕایەکی تایبەت بە خۆتت نییە.

تـۆ کێیـت تـا خـۆت لە سیاسـەتدا هەڵقورتێنیـت؟ دەزانـم ئەمەم زۆر بیسـتووە، بەڵام لێـت دەپرسـم: بـۆچی ئەرکەکەت ئەنجـام نادەیـت کاتێـک کەسـێک پێـت دەڵێـت: دەبێـت بەرپرسـیارێتیی کـارەکەت لە ئەسـتۆ بگریـت، یـان پێت دەڵێت: نابێت لە منداڵەکانت بدەیت، یان شوێن هیچ دیکتاتۆرێـک مەکەوە؟ ئەرکـی تـۆ چیـیە؟ ئەو کـاتیش گـوێڕایەڵێکی بێزیانیـت بـۆ ئەم قسـانە؟ نەخێـر پیـاوی بچووک، تۆ گوێ لە ڕاستییەکان ناگریت، تەنیا گوێ لە کەسـێک دەگریـت کە دەنگەدەنـگ بنێـتەوە. پاشـان هـاوار دەکەیـت و لە پیاهەڵـدان ناکەویـت، تـۆ ترسـنۆک و توندوتیژیت، هەستت بەرانبەر ئەرکە ڕاستەقینەکەت نییە، کە وەک مـرۆڤ هەڵسـوکەوت بکەیـت و مرۆڤـایەتی بپارێزیـت. تـۆ زۆر بێتوانایـت لە لاسـایکردنەوەی ئەو پیـاوانەی زۆر شـارەزان و، لە لاسـاییکردنەوەی دزەکانـدا زۆر لێهاتوویـت. فیلمەکانـت، پرۆگرامـی ڕادیۆییـت، "کتێبـی چیرۆکە وێنەییەکان"ت تەژیین لە کوشتن.

تۆ دەبێت خۆت و بچووکییە چەند سەدەییەکەت لەو کـارە خراپـانە دەربهێنیـت، بـۆ ئەوەی ببیـت بە گەورەی خۆت. من لە تۆ جیابوومەتەوە و ماڵئاواییم لێ کردبوویت، بۆ ئەوەی لە داهـاتوودا زیـاتر خزمەتـت بکەم. چـونکە کە دووربـم لێـتەوە، ناتوانیـت بمکوژیـت و زیـاتریش ڕێـز لە کـارەکەم دەگریـت. **هەر کەسـێکە کە نزیـک لێـتەوە بێـت، ڕیسـوای دەکەیـت.** هەربـۆیە جەنەڕاڵەکانـت لە شـوێنێکی

بەرزتر لە خۆت داناوە، بۆ ئەوەی بتوانیت ڕێزیان لێ بگریت، هەرچەندە بێقیمەت و هیچوپووچ بن. هەر لەبەر ئەمەیشە پیاوە مەزنەکە خۆی لە تۆ بەدوور گرتووە، زیاتر لە هەر کاتێکی تر کە لە مێژوودا تۆمار کرابێت.

"ئەو خۆ بەزلزانە! شێت بووە، تەواو شێت بووە!"

دەزانم پیاوی بچووک، کاتێک بەو ڕاستییە دەگەیت کە بە دڵی تۆ نییە، لە دەستنیشانکردنی شێتیدا زۆر خێرایت. خۆت بە "کەسێکی ئاسایی" دەزانیت. مرۆڤە شێتەکانت زیندانی کردوون، مرۆڤە باوەکانیش ئەم جیهانە بەڕێوە دەبەن، دەبێت کێ لە پای ئەم هەموو کڵۆڵییە سەرکۆنە بکرێت؟ بەدڵنیاییەوە تۆ نا، تۆ تەنیا ئەرکی خۆت جێبەجێ دەکەیت، تۆ کێیت تا بیروڕای تایبەت بە خۆتت هەبێت؟ دەزانم نامەوێت دووبارەی بکەمەوە. ئەمانە کێشەی خۆتن پیاوی گچکە. بەڵام کاتێک بیر لە منداڵە تازە لەدایکبووەکانت دەکەمەوە کە خۆت ئەشکەنجەیان دەدەیت بۆ ئەوەی ببن بە مرۆڤی "ئاسایی"ی وەک خۆت، پاشان جارێکی تر فریو دەدرێم تا لە تۆ نزیک ببمەوە، بۆ ئەوەی ڕێگە لە تاوانەکانت بگرم، بەڵام ئەوەیش دەزانم زۆر چاک گرنگیت بە پاراستنی خۆت داوە، لە ڕێگەی دامەزراندنی بەشێکی پەروەردەییەوە.



هەربۆیە جەنەڕاڵەکەت لە شوێنێکی بەرزتر لە خۆت داناوە، بۆ ئەوەی بتوانیت ڕێزی لێ بگریت

هـۆ پیاوی بچووک! دەمەوێت بتبەم و بەم جیهانەدا بتگەڕێنم و، پێتی نیشان بدەم تۆ کێیت و کێ بوویت؟ لە ئێستا و ڕابردوودا، لە ڤیەننا، لە لەندەن لە بەرلین، وەک "هەڵگری خواستی خەڵکی،" ئەندامی چەند باوەڕ و ئایینێک. دەتوانیت لە هەموو شوێنێک خۆت بدۆزیتەوە، دەتوانیت خۆت بناسیتەوە، چ فەڕەنسی، ئەڵمانی یان ئەندامی هۆزێک لە هۆزە بچووکەکانی باشووری ئەفریقا، یان نامبیا بیت، ئەمەیش ئەگەر بوێری و ئازایەتیی ئەوەت هەبێت تەماشای خۆت بکەیت.

دەڵێیت: "گوێ بگرن! سووکایەتی بە ئابڕووم دەکات، ئەرکەکەم دەشێوێنێت!"

پیاوی بچووک، من کاری وا ناکەم. خۆشحاڵ دەبم گەر ئەوە بسەلمێنیت کە لە تواناتدایە تەماشای خۆت بکەیت و خۆت بناسیتەوە. وەک چۆن بەڵێندەرێک کە خانوویەک بینا دەکات دەبێت بەڵێنی ئەوە بدات ئەو خانووەی دروستی دەکات تۆکمە بێت و بۆ ژیان دەست بدات، بەڵێندەرەکە مافی ئەوەی نییە هاوار بکات و بڵێت: "سووکایەتی بە ئابڕووم دەکات،" کاتێک ئەوەی بۆ ڕوون بکەمەوە کە تەنیا لەبارەی "ئەرکی دروستکردنی خانووەوە" قسە دەکات لەبری دروستکردنی خانووەکە. بەهەمان شێوە، تۆ دەبێت ئەوە بسەلمێنیت کە هەڵگری داهاتووی مرۆڤایەتیت، چیتر ناتوانیت لەژێر پەردەی "ئابڕووی نەتەوە"وە، یان "ئابڕووی کرێکاران"ەوە خۆت

بشـــــاریتەوە، چـــــونکە تـــــۆ بەشـــــێکی زۆری خۆتـــــت ئاشکراکردووە، پیاوی بچووک.

وەک وتــم ماڵئاواییــت لــێ دەکەم. چەنــدین ســـاڵ و چەنــدین شــەونخونیی پــڕ ئــازاری ویســتووە تــا وابــکەم. بوونت بە ڕابەری گشت کرێکاران هێندە زەحمەت و ئاڵۆز نیـیە. ئەوانەی ئەمــڕۆ ڕابەرانــی تــۆن، ســبەینێ دەبــن بە نووسەری ڕۆژنامە بچووک و هەرزانەکان. بیروڕاکانیان دەگۆڕن، هەروەکوو چۆن خەڵکی کراسەکانیان دەگۆڕن. بەڵام مـن وا نـاکەم، بەردەوام دەبـم لە بەتەنگەوەهاتنی تۆ و چارەنووســت. بەڵام کاتێــک لە تواناتــدا نیــیە ڕێــز لە کەســێک بگریــت کە نــزیکە لێــتەوە، ناچـــارم مەودایەک لەنێوانماندا بهێڵمەوە و خۆمت لێ بەدوور بگرم. نەوەکانت دەبن بە میراتگری کارەکانم، چاوەڕێیان دەبم تا چێژ لە بەرووبــوومی کارەکــانم ببیــنن، وەک چــۆن ســی ســـاڵ چــاوەڕێی تــۆ بــووم کە ســوود لە کارەکــانم وەربگریــت، لەبـــری ئەوەی بەردەوام هـــاوار بکەیـــت: "بڕووخێـــت سەرمایەداری" یان "بڕووخێت دەستووری ئەمێریکایی!"

هەی پیـاوی گـرگن! دوام بـکەوە. دەمەوێـت هەنـدێک دیمەنـــی خۆتـــت پیشـــان بـــدەم، ڕامەکە، قێــزەونە، بەڵام لەهەمان کاتیشدا بەسوودە، زۆر تۆقێنەر نین.



کاتێک بیر لە نەوزاکانت دەکەم، کە جۆرێک جەزرەبەیان دەدەیت تا بیانکەیت بە "مرۆڤی ئاسایی" و دوای سەرگەورە بەبتکراوەکانت بکەون...

نزیکەی سەد ساڵ پێش ئێستا فێری ئەوە بوویت وەکوو تووتی لاسایی ئەو فیزیاگەرانە بکەیتەوە کە ئامێریان دروست کرد، وتت: "خۆ ڕۆحی تێدا نییە." پاشان پیاوێکی مەزن هات و ڕوحی خۆتی نیشاندایت، هەرچەندە ئەو پەیوەندیی نێوان "ڕۆح" و "جەستە"تی نەدەزانی. وتت: "قسەی بێمانا، 'شیکردنەوەی دەروونی!' دەتوانیت شیکاریی 'میز' بکەیت، بەڵام ناتوانیت شیکاریی 'دەروون' بکەیت". ئەمەت وت چونکە لە پزیشکیدا تەنیا شیکاریی میز دەزانیت. شەڕکردن لەپێناو ئاوەزی تۆدا چل ساڵی خایاند، لەو شەڕە قورسە ئاگادارم، چونکە من لەجیاتی تۆ بەشداربووم تیایدا. ڕۆژێکیان ئەوەت بۆ دەرکەوت کە مرۆڤ دەتوانێت پارەیەکی زۆری لە مرۆڤێکی مێشک نەخۆشەوە دەست بکەوێت. بۆ ئەوەیش دەبێت نەخۆشەکە ناچار بکەیت ڕۆژانە و بۆ ماوەی کاتژمێرێک و تا چەند ساڵێک سەردانت بکات و، بڕە پارەیەکی دیاریکراویش لە بەرانبەر هەر کاتژمێرێک بدات.

ئەو کات کە ئاوەز بوو بە هۆکارێک بۆ دەستکەوتنی پارە، بڕوات بە بوونی هێنا. لەهەمان کاتیشدا زانیاری لەسەر جەستەت تەواو گەشەی کرد، ئەوەم بۆ دەرکەوت کە ئاوەزی تۆ کرداری وزەی ژیانتە، بە مانایەکی تر، یەکڕیزییەک هەیە لەنێوان ئاوەز و جەستەتدا. بەم ڕێیەدا چووم و، ئەوەم بۆ دەرکەوت کاتێک هەست بە باشی و خۆشویستن دەکەیت، وزەی ژیانت دەپشکوێت. کاتێکیش

دەترسیت، وزەی ژیانت دەچێتەوە یەک و کرژ دەبێتەوە بۆ چەقی جەستەت. بە درێژاییی پانزە ساڵە تۆ سەبارەت بەو دۆزینەوانە بێدەنگیت، بەڵام من لەسەر هەمان ڕێگا بەردەوام بووم و ئەم وزەی ژیانەم دۆزییەوە کە ناوم نا: "ئۆرگـۆن،" کە لە دەرەوەی جەستـەی تۆیشـدا هەیە، لە بەرگەهەوایشدا هەیە. سەرکەوتوو بووم لە دروستکردنی ئامێرێکدا کە لە ڕێیەوە ئەو وزەی ژیانە لە تاریکیدا ببینم، ئامێرێـک کە گەورەی دەکـرد و وای لـێ دەکـرد کە کڵـپە بسێنێت. ئەو کاتەی تۆ خەریکی یاریی کاغەز بوویت، یان ئازاری ژن و منداڵەکەت دەدا، لە ژووری تاریکدا چەندین کاتژمێر بە درێژاییی دوو ساڵ دادەنیشتم و دەمڕوانی تا تەواو دڵنیا بووم لەوەی وزەی ژیانی تۆم دۆزیوەتەوە. بەرە بەرە فێری ئەوە بووم پیشانی خەڵکی تریشی بدەم، بۆم دەرکەوت ئەوانیش هەمان ئەو شتە دەبینن کە من دەمبینی.

ئەگەر پزیشکێک بیت کە بڕوای وایە عەقڵ دەردانی ڕژێـنە ناوەکییەکـانە، ئەوا بە یەکێـک لە نەخۆشـە چاکبووەکـانم دەڵێـت کە چـاکبوونەوەت دەرئەنجـامی "بۆچوونێک" بووە. ئەگەر بەدەست دڕدۆنگی[1] و ترسان لە تاریکییەوە بناڵێنیت، ئەوا دەڵێت ماوەیەک لەومەوپێش درکم بەو دیاردەیە کردووە و تەنیا "بۆچوونێک"ە و، ئەو

---

[1] دڕدۆنگی: دوودڵی

چارەسەرکردنە لە دانیشتنێکی ڕووحانی دەچێت. تۆ بەو شێوەیەیت پیاوی بچووک، وەکوو چۆن لە ساڵی 192٠ نکۆڵیت لە بوونی "ڕۆح" کردووە، ئاوەهایش لە ساڵی 1945 بێهیوایانە فلتەفلتت لەسەر ڕۆح کرد. ئەی پیاوی بچووک! هەر بچووکی مایتەوە. بەبێ دووڵی لە ساڵی 1984دا پارەیەکی زۆر لە ڕێی ئۆرگۆنەوە بەدەست دەهێنیت و، لەسەر هەمان شت بەردەوامیت و بێ سڵەمینەوە حەقیقەتێکی تر دەکوژیت و گومانی لێدەکەیت و ناوی دەزڕێنیت، ڕێک هەمان ئەو کارەی بە دۆزینەوەی ئاوەز و وزەی گەردوونت کرد. هێشتایش هەر وەک ئەو پیاوە بچووکە ڕەخنەگرە دەمێنێتەوە کە لێرە و لەوێ " بڕژی بڕژی" دەکات. بیرتە چیت وت سەبارەت بە دۆزینەوەی ئەوەی کە زەوی سەقامگیر نییە، بەڵکو بە دەوری خۆردا دەسوڕێتەوە؟ وتت: "ئەو دۆزینەوەیە گاڵتەیەکی قۆڕە، ئەگەر وا بێت، دەبێت پەرداخی سەر سینیی شاگردەکان بکەونە خوارەوە." پیاوی بچووک، ئەمە چەند سەدەیەک لەمەوبەر بوو و، بە دڵنیاییەوە، لەیادت کردووە. هەموو ئەوەی سەبارەت بە نیوتن دەیزانیت ئەوەیە: "سێوێکی بینیوە لە دارێک کەوتووەتە خوارەوە." سەبارەت بە ڕۆسۆ تەنیا ئەوە دەزانیت: "ئەو ویستوویەتی بگەڕێتەوە بۆ سروشت." تەنیا شتێکیش سەبارەت بە داروین فێری بوویت ئەوەیە: "شەڕ لە پێناوی مانەوەدا،" بەڵام هیچ سەبارەت بە ڕەچەڵەکت

نازانیت کە دەگەڕێیتەوە بۆ مەیموون، لە "فاوست"ەکەی "گۆتە"یش کە زوو زوو بە نموونە دەیهێنیتەوە، چەندە پشیلەیەک لە بیرکاری تێدەگات، تۆیش ئەوەندە تێدەگەیت. هۆ پیاوی بچووک، تۆ گەمژە و بەتاڵ و نەفام و مەیموون ئاسایت. هەمیشە دەزانیت چۆن خۆت لە پێویستییەکان لا بدەیت و دەست بەسەر شتە ناڕاستەکاندا بگریت. ناپلیۆنەکەت، ئەو پیاوە بچووکەی کە هیچی لێ نەمایەوە جگە لە مەشقی سەربازیی زۆرەملێ، لە کتێبخانەکەتدا بە پیتی ئاڵتوونی ڕازاندووتەتەوە، بەڵام کیپلەرەکەی من کە پێشبینی بنچینەییی گەردوونەکەتی کردووە، لە هیچ شوێنێکی کتێبخانەکەدا نابینرێت. پیاوی بچووک! هەر لەبەر ئەمانە لەو زەلکاوە ڕزگارت نابێت کە تێی کەوتوویت. لەبەر ئەمەیە ناچارم پێت بڵێم کاتێک بڕوات وایە من بۆ ماوەی بیست ساڵ کارم کردووە و نیگەران بووم و قوربانیم داوە، بۆ ئەوەی وات لێ بکەم بڕوا بە بوونی وزەی "ئۆرگۆن" لە گەردووندا بهێنیت. نەخێر پیاوی بچووک، بە بوونی هەموو ئەو قوربانییانە، بەڕاستی فێری ئەوە بووم کە چۆن دەردەکەی ناو لەشت چارەسەربکەم. تۆ بڕوا بەوە ناکەیت، چونکە لە نەرویج گوێم لێت بوو دەتوت: "ئەگەر کەسێک ئەو هەموو پارەیە لە تاقیکردنەوەکانیدا سەرف بکات، بە هەموو مانایەک کەسێکی شێتە." لەمە تێگەیشتم، تۆ لە خۆتەوە دەڕوانیت، تۆ تەنیا دەتوانیت وەربگریت، ناتوانیت ببەخشیت، بۆیە

شتێکی نامەقوڵە بەلای تۆوە کەسێک لە ژیاندا چێژ لە بەخشین وەربگرێت. هەروەک چۆن بەلاتەوە نامەقوڵە کەسێک لەگەڵ ڕەگەزی بەرانبەریدا پێکەوە بن، بێ ئەوەی بیانەوێت سەرجێیی بکەن.

دەمتوانی ڕێزت بگرم، ئەگەر لە دزینی ئاسوودەییەکەی خۆتدا کارامە بویتایە. بەڵام تۆ دزێکی بچووک و ترسنۆکیت، تۆ زیرەک و کارامەیت، بەڵام لەباری دەروونیدا وشکهەڵاتوویت، ناتوانیت داهێنەر بیت. بەوشێوەیە، هەروەک چۆن فرۆید جارێک پێی وتیت ئێسکێک دەدزیت و بە سنگەخشێ دەیبەیت، تا لەکونێکدا بیخۆیت. تۆ لە دەوری بەخشەرە خۆبەخش و ئاسوودەکان کۆدەبیتەوە و خوێنیان دەمژیت تا وشکیان دەکەیت. تۆ خوێنمژەکەیت، بەڵام ئەوان بە خوێنمژەکە ناو دەبەیت. تۆ ورگی خۆت بە زانیاری و ئاسوودەیی و مەزنیی ئەوان تێر دەکەیت، بەڵام ناتوانیت ئەوەی قووتت داوە، هەرسی بکەیت و ڕاستەخۆ دەیکەیت بە گوو و بۆگەنێکی ترسناکی لێ دێت. یان بۆ ئەوەی شکۆداریت بپارێزیت، دوای ئەو دزییەی کە ئەنجامت داوە، بەخشەرەکە دەکوژیت و بە شێت و منداڵ و قۆڵبڕ و فریودەر ناوی دەبەیت.

ئەی هاوار بەدەست تۆوە "منداڵفریودەر." پیاوی گرگن! بیرتە ئەو کات سەرۆکی کۆمەڵەیەکی زانستی بوویت؟ پڕوپاگەندەت بڵاو دەکردەوە کە گوایە من ڕێگەم

داوە منداڵەکانم تەماشای کردەی سێکسکردن بکەن؟ ئەمە دوای بڵاوبــوونەوەی یەکەم وتــارم بــوو لەســەر مــافە سێکسییەکانی منداڵانی پێنەگەیشتوو. یان جارەکەی تر بە هەڵـکەوت بـۆ مـاوەیەکی کـاتی بووبوویـت بە سـەرۆکی ڕێکخراوێکـی فەرهەنگـی لە بەرلـین، تـۆمەتی ئەوەت بـۆ هەڵبەسـتم کە گـوایە کچـانی هەرزەکـارم لەگەڵ خۆمـدا سـوارکردووە و بردوومن بۆ دارسـتان تـا لەوێ فریویـان بدەم؟ مـن هەرگیز کچی هەرزەکارم لە خشتە نەبردووە. پیاوی بچووک، ئەمە خەیاڵە پیسـەکانی تۆن نەک مـن، مـن کچە دۆسـتەکەم و ژنەکەیشـمم خۆشـدەوێن، وەک تـۆ نیم کە ناتوانیــت ژنەکەیشــت خۆشــبوێت، لەبەر ئەوە پێــت خۆشە کچانی هەرزەکار لە دارستانەکاندا فریو بدەیت.

تۆ ئەی کچی هەرزەکار! خەو بە پاڵەوانەی فیلمێکەوە نابینیــت؟ وێنەکانیــان لەگەڵ خــۆت نــابەیتە جێگــای نوســتنەکەتەوە؟ خــۆت لێــی نزیــک نەکــردووەتەوە و لە خشــتەت نەبــردووە؟ وا خــۆت نیشــان داوە تەمەنــت لە هەژدە ساڵ گەورەترە؟ ئەی دواتر نەچوویت بۆ دادگا و بە تۆمەتی دەستدرێژیکردنە سەرت، تۆمەتبارت کرووە؟ لە دادگـا یـان ئـازاد دەکرێـت یـان تاوانبـار دەردەچێـت و، داپیرەکانــت دەســتی ئەو پــاڵەوانە مەزنەی ســینەما مــاچ دەکەن.

دەتویســت لەگەڵ پــاڵەوانی نێـو فـیلمە سـینەماییەکان بخەویـت، بەڵام ئەو ئـازایەتییەت نـیـیە کە بەرپرسـیارێتیی

حەز و ئارەزووت لەئەستۆ بگریت، بۆیە ئەوت تاوانبار کرد کە دەستدرێژی کردووەتە سەرت. کچە داماوە ماف پێشێلکراوەکە یان ئەی ئەو ژنە بەستەزمانەی کە بە زۆر دەستدرێژیی سێکسیت کراوەتە سەرت، تۆیەک کە تامی ئەزموونی چێژی سێکسیی زیاترت لەگەڵ شۆفێرەکەت کردووە وەک لە مێردەکەت. ئەی تۆ شۆفێرە ڕەشپێستەکەت فریو نەداوە و لە خشتەت نەبردووە کە تا ڕادەیەکی زۆر سێکسێکی تەندروستی ئەنجامدا؟ ئەی ژنە بچووکە سپیپێستەکە؟ ئەی دواتر بەوە تۆمەتبارت نەکرد کە دەستدرێژیی کردووەتە سەرت؟ ئەی ژنە بەستە زمانە داماوەکە؟ تۆ قوربانیی دەستی ئەو ڕەگەزەیت کە هەمیشە لەژێرەوە بووە؟ نەخێر بە دڵنیاییەوە تۆ بێگەرد و سپی پێستیت، تۆ کچی "ئەم یان ئەو شۆڕشەیت،" خەڵکی وڵاتێکی باشوور یان باکووریت کە باپیرەی بە ڕاکێشانی ئەفریقییە ڕەشپێستەکان بۆ ناو کۆت و زنجیری ئەمێریکاییەکان دەوڵەمەند بوون. چەند بێ زیان و پاک و بێگەرد و سپیت، هیچ ئارەزوویەکت بۆ ڕەش پێستەکان نییە، تۆ ژنێکی بچووکی بەستە زمانیت. تۆ ئەی ژنە ترسنۆکە کڵۆڵەکە، نەوەی ڕەگەزی نەخۆشیی ڕاوچی کۆیلەکانیت، نەوەی ئەو "کۆرتێز"ەی کە سەرنجی هەزاران خۆشباوەڕی "ئەزتێک"ی ڕاکێشا و هەڵیخەڵەتاندن بۆ ئەوەی بیانکاتە داوەکەوە و بیانکوژیت.



کچی ئەم یان ئەو شۆڕس

هـۆ کـچە داماوەکـانی ئەم یـان ئەو شـۆڕش، چـی لە ئـازادیی ئافرەتـان تێگەیشـتن؟ لە خەبـاتی شۆڕشـەکانی ئەمریکـا تێگەیشـتن؟ یـان چـی لە لینکـۆڵن تێگەیشـتن کە کۆیلەکـانی بـۆ ئـازاد کـردن، ئەو کـۆیلانەی خسـتنتە نـاو بازاڕی کێبڕکێی ئـازادەوە؟ کچانی شۆڕشـەکان تەماشـای ئـاوێنە بـکەن و خۆتـان ببیـنن، بـزانن خۆتـان لە "کچـانی شۆڕشی ڕووسیا"دا دەناسنەوە، ئەی کچە بێزیـان و پـاک و بێگەردەکان؟

ئەگەر ئێـوە تەنیـا جارێـک بتانتوانیـایە پیاوێکتـان خۆشبوێت، ئەوا ژیانی چەندین ڕەشپێست و جوولەکە و کرێکـار دەپـارێزرا. وەک چـۆن ژیـانی خۆتـان لە منداڵەکانتانـدا دەکـوژن، ئـاوایش بە خەیـاڵی لیپاولیـپ[1] لە ئـارەزووی سێکسـی، خۆشەویسـتی لە ڕەشپێسـتەکاندا دەکـوژن. دەتانناسـم، ئێـوە کچـان و ژنـانی زەنگینەکـانن. دەزانـم نـاوگەڵی ڕەقوتەقتـان چ بەدکـارییەکی هێنـاوەتە کـایەوە! نـا، تـۆ ئەی کچـی ئەم یـان ئەو شـۆڕش، هـیچ مەبەسـتێکم نەبـوو بـبم بە دادوەر، یـان ڕێگەپێـدراوی پۆلیس، ئەمانە بۆ ئەو بوونەوەرە بەڕێزانە بەجێ دەهێڵم کە جلوبەرگی فەرمییـان پۆشـیوە، بـا بـۆ ئەوان بێت. مـن باڵنـدەکان و ئاسـک و سـمۆرەکانم خۆشـدەوێت، چـونکە ئەوان هـاوڕێی نزیکـی ڕەشپێسـتەکانن، مەبەسـتم

[1] لیپاولیپ: پڕ، تەژی

ڕەشپێستەکانی دارستانە، نەک ئەوانەی "هارلێم"[1] کە بە جلوبەرگی کەشخەوە دەگەڕێن، مەبەستم ئەو ژنە ڕەشپێستە قەڵەوە گوارە لە گوێیانە نییە کە حەز و ئارەزووی کپکراو و بەدیینەهاتوویان بووەتە مایەی قەڵەوبوونی سمت و ڕانیان. مەبەستم لەش و لاری نەرم و لووس و ناسکی کچانی زەریای باشوورە کە تۆی پیس و پۆخڵی ئەم یان ئەو سوپایە دەیانخەیتە ژێر خۆت؛ ئەو کچانەی نازانن تۆ ئەو خۆشەویستییە پاک و بێگەردەیان وەک لەشی لەشفرۆشەکانی جندەخانەکانی "دێنڤەر" دەبینیت.

نا، کچەکەم، تۆ تاسەی کەسێکی زیندوو دەکەیت کە تا هەنووکەیش لەوە تێنەگەیشتووە دەخاپێنرێت[2] و سووک تەماشات دەکرێت. بەڵام کاتی تۆ هاتووە، تۆ وەک پاکیزە ئەڵمانییەکە کردارەکانت وەستاندووە، بەردەوام وەکوو کچانی پاکیزەی ڕووسیایی یان کچانی شۆڕش لەناوماندا دەژییت. لەدوای سەدەیەکی تر، کاتێک کوڕان و کچانی تەندروست چێژ لە خۆشەویستی وەردەگرن و

---

[1] یەکەم گەڕەکی ڕەشپێستنشینی لە بەشی باکووری مانهاتان لە شاری نیو یۆرک.(هەڵەچن)

[2] خاپاندن: هەڵخەڵەتاندن، فریودان(دەخاپێنرێت: هەڵدەخەڵەتێنرێت)

دەپیاریزن، ئەو کات هیچ شتێکی تۆ لە بیرەوەریماندا نامێنێت، جگە لە یادەوەرییەکی پێکەنیناوی و گاڵتەپێکردن.

ئەی ژنە بچووکە شێرپەنجاوییەکە! تۆ نەبوویت ڕێت نەدا ماریان ئەندرسۆن، دەنگە زیندووەکەی ئەمریکا، هۆڵی کۆبوونەوەکەت بەکار بهێنێت؟ ناوی ئەو بۆ چەند سەدەیەک لە گوێماندا دەزرنگێتەوە، لە کاتێکدا هیچ جێپەنجەیەکی تۆ نامێنێت. لە خۆم دەپرسم ئاخۆ ماریان ئەندرسۆن بۆ چەند سەدەیکی تریش بیر دەکاتەوە، یان ئەویش لەبەردەم خۆشەویستیی منداڵەکەیدا دەبێتە ڕێگر؟ نازانم؛ ژیان چەندین هەڵبەز و دابەزی تێدایە. بە خودی ئەو ژیانە قایلە. ئەوە لەنێو تۆدا نازی، هۆ ژنە شێرپەنجاوییە گرگنەکە.

هەی ژنی بچووک! تۆ ئەو چیرۆکەی پیاوە بچووکەکانت بە تووک و پێستەوە قووتیان داوە، بڵاو دەکەیتەوە کە تۆ "کۆمەڵگایت،" بەڵام تۆ کۆمەڵگانیت. هەموو ڕۆژێک لە ڕۆژنامە جوولەکەیی و مەسیحییەکاندا ئەوە ڕادەگەیەنیت کە کچەکەت هەر کات بیەوێت دەتوانێت پیاوێک لەباوەش بگرێت، بەڵام بەرلاییی هیچ تاکێکی دونیا جێی بایەخ نییە. کۆمەڵگا لە من و دارتاش و باخەوان و مامۆستا و پزیشک و کرێکاری کارگەکان پێک دێت، ئەمە کۆمەڵگایە نەک تۆ، هەی ژنە ڕەقوتەق و دەمامکدار و شێرپەنجاوییە بچووکەکە. تۆ ژیان نیت، تۆ شێوێنەر و نەفرەتی ژیانیت. بەڵام لەوە تێدەگەم بۆچی خۆت لەپشت

دژی[1] دەوڵەمەنـدیتەوە حەشـارداوە. چـونکە ئەوە تـاکە شـتێکە کە توانیـوتە دەرهەق بە بچـووکی و بێنرخیـت بەرانبەر بە دارتاشـەکان و باخەوانەکـان و پزیشـکەکان و مامۆسـتاکان و کرێکـارانی کارگەکـان بیکەیـت. لە چوارچێـوەی ئەو دەردەدا ئەوە ژیرانەتـرین کـارێکە کە کردبێتت. بەڵام بچـووکی و بێنرخـی لە مـۆخ و قەبـزی و ڕۆماتیزم و دەمامک و دانپیاندانەکانی ژیانتدایە. تۆ ژنێکی خەمگـین و داماویـت، چـونکە کوڕەکانـت لەنـاو دەچـن، کچەکانـت بـوون بە لەشـفرۆش، پیاوەکەیشـت وشـک دەبێتەوە، ژیان و دامارەکانت بۆگەنیـان کردووە. هۆ کـچە بچـووکەکەی شـۆڕش! ناتوانیـت هـیچ چیـرۆکێکمم بـۆ بگێڕیتەوە؛ بە ڕووتوقووتی دیومیت.

تۆ ترسنۆکیت و هەمیشەیش وابوویت. ئاسوودەیی و بەختیـاریی مرۆڤـایەتی لەنێـو دەسـتەکانتدا بـوو، بەڵام دۆڕانـدت. تـۆ چەنـدین سـەرۆککۆمارت هێنـایە بـوون و بچـووکی و بێنرخیـی خۆتـت پـێ بەخشـین. سـەرۆککۆمارەکانت وێـنەی خەڵکـی دەگـرن، کاتێـک مەدالیایـان بەسـەردا دەبەخشـنەوە و بـۆ دوایەمـین جـار پێدەکەنن و زاتی ئەوەیان نییە ڕووبەڕووی ژیان ببنەوە. کچە بچووکەکەی شۆڕش! جیهان لەنێو دەستەکانتدا بوو و دواجار بۆمبی ئەتۆمیت بەسەر هیرۆشیما و ناکازاکیدا

[1] دژ: قەڵا

بارانـد. مەبەسـتم کـوڕەکەتە ئەو بۆمبـانەی بەسـەر ئەو شـارانەدا باراند تـا بزانێت چـی ڕوودەدات. ژنە بچـووکە شـێرپەنجاوییەکە! تـۆ خـۆت گـۆڕی خۆتـت هەڵکەنـد، بە بۆمببـارانکردنی ئەو شـارانە تەواوی چـین و ڕەگەزەکانـت بـۆ هەتاهەتـایە بە بێدەنگیی نێـو گـۆڕ سپارد، چـونکە تـۆ ئەوەنـدە مرۆڤایەتیـت تیـادا نەبـوو تـا پیـاوان و ژنـان و منـداڵانی هیرۆشـیما و ناکـازاکی لەم کارەسـاتە ئاگـادار بکەیـتەوە، نەتتـوانی مرۆڤێکـی مەزن بیـت. لەبەر ئەم هۆکارە بە بێدەنگی وەک ئەوەی بەردێک لە دەریادا نقوم بێت، ون بوویت. گرنگ نییە ئێستا چۆن بیردەکەیتەوە یان چی دەڵێیت؟ تۆ ژنکۆک! چەندین جەنەڕاڵی شێتت هێنایە بوون، سەدان ساڵی تر خەڵکی پێت پێدەکەنن و سـەریان لە کارەکانـت سـووڕ دەمێنێت. ئەوەی ئێسـتا نەبوویـت بە مایەی گاڵتەپێکردن و سەرسوڕمان، بەشێکە لەو کڵۆڵی و داماوییەی دونیای تەنیوە.

ژنکـۆک! دەزانـم بە نیـازی چـی بڵێیـت؟ هەمـوو دەرکەوتنەکان و پارێزگاری لە نیشتمان و هەر شـتێکی تر کە ڕوو دەدەن، لە قـازانجی تـۆدا دەبـن. مـن ئەمەم لە گەڕانەوەمدا لە ڕێگای نەمسـای کۆن بەرگوێ کەوت. ئایا قەت لە عارەبـانەچییەکی ڤیەنناتـان بیسـتووە بڵێت: "بـژی قەیسـەر"؟ نەخێر! تۆ دەبێت تەنیا گوێ لە خۆت بگریت، هەمان مۆسیقایە. نەخێر، ژنی بچووک، من لە تۆ ناترسم؛ ناتوانیـت هـیچ شـتێک لە مـن بکەیـت. ڕاسـتە زاواکەت

یاریـــدەدەری دادوەری نـــاوچەیەکە، یـــان بـــرازاکەت یاریـــدەدەری بـــاجگرە، بانگهێشـــتی چـــاخواردنەوەیەکی دەکەیـت و هەنـدێک شـتی سـەبارەت بە مـن بە گوێـدا دەدەیـت. ئەویـش لەبەر ئەوەی دەیەوێـت پلەوپـایەیەکی بەرزتـری هەبێـت و ببێـت بە دادوەری نـاوچەکە یـان بەڕێوەبەری باجگری شار؛ بە دوای قوربانییەکی "یاسـا"دا دەگەڕێت. دەزانـم ئەم شـتانە چۆن ئەنجام دەدەیت، بەڵام ژنـی بچـووک، ئەم جـۆرە کـارانە ناتوانێـت بتپارێزێـت؛ حەقیقەتەکەی من لە هی تۆ بەهێزترە.

"ئەو دەمـارگیرێکی تـاکڕەوە! ئەی مـن هـیچ ڕۆڵێکم لە کۆمەڵگادا نییە!"

تەنیـا ئەوەم پیشـاندایت کە تـۆ چەنـدە بچـووک و بەدکاریت، هەی ژنی بچووک، هۆ پیاوی بچووک. تەنـانەت هێشـتا ئامـاژەم بە بێکەڵکی و بێسـوودی ئێوە نەکردووە. پێتانوایە قسەیەکم پێ دەوتن کە بۆ ژیان پڕ مەترسی بێت ئەگەر گرنـــگ نەبوونـــایە؟ بچـــووکی و نزمیتـــان زۆر تـــــۆقێنەرە، ئەگەر لەبەر ڕۆشـــــنایی گرنگـــــی و ئەو بەرپرسـیارێتییە گەورەیەی کە لە ئەسـتۆتاندایە ببینـرێن، ئەوان دەڵێن تۆ گەمژەیت. مـن دەڵـێم ئێوە زیرەکن، بەڵام ترســـنۆکن. ئەوان دەڵـــێن تـــۆ پیســـایی کـــۆمەڵگەی مرۆڤایەتییـت. مـن دەڵـێم ئێـوە تـۆوی ئەو کـۆمەڵگەیەن. ئەوان دەڵێن کلتوور پێویستی بە کۆیلەیە. من دەڵێم نەخێر هیچ کلتوورێک بە دەستی کۆیلە بنیاد نانرێت. ئەم سـەدەی

بیســـتەمە ترســـێنەرە ئەوەی ســـەلماند کە هەمـــوو ئەو بیــردۆزە کلتوورییــانەی لە دوای ئەفلاتــۆنەوە گەشــەیان کردبێت، مـایەی گـاڵتەپێکردن و پێکەنینن. پیـاوی بچـووک! کلتووری مرۆڤـایەتی تـا ئێستا بـوونی نەبـووە. ئێمە تـازە خەریـکە لە لادانــی ترســێنەر و وەرگـۆڕانی نەخـۆش بـۆ ئاژەڵێکی مرۆیی تێدەگەین. "وتەیەک بۆ پیاوە بچووکەکە" یـان هەر نوسـراوێکی لێوەشـاوەی تری ئەم سـەردەمە بۆ کلتووری هەزار یان پێنج هەزار ساڵی تر دەبن کە بونیاد دەنــرێن، هەر وەک چــۆن هەزاران ســـاڵ پــێش ئێســـتا ڕەوڕەوە دروستکرا و بوون بە بزوێنەرەکانی ئەمڕۆ

پیـاوی بچـووک، تـۆ هەمیشــە کـورت بینیـت، بیـر لە داهـــاتوو نـــاکەیتەوە، مەودای بیرکردنەوەکانــت لەنێــوان قـاوەڵتی و فراوینـدایە. ناتوانیـت دوورتـر ببینیـت، پێویستە خـۆت فێـر بکەیـت بیـر لە چەنـدین ســەدەی ڕابـردوو و هەزاران سـاڵی داهـاتوویش بکەیتەوە. پێویسـتە خـۆت فێر بکەیــت بیـــر لە زینـــدوویی ژیـــان بکەیـــتەوە، لە ئاســـت گەشەســـەندنت لە یەکەم تـــوێژاڵی پلازمـــاییەوە تـــا ئەو مرۆڤەی کە دەتوانێت لەسەر پێیەکانی بڕوات. بەڵام هێشتا ناتوانێـــت ڕوون و ڕەوان بیربکـــاتەوە. تـــۆ یادەوەریـــت لەدەستداوە، تەنـانەت بۆ ئەو ڕووداوانەی کە دەیـان سـاڵ لەمەوبەر ڕوویانداوە، هەر بۆیە هەمان گەمژەیی دووبـارە دەکەیتەوە کە دوو هەزار ساڵ لەمەوبەر وتووتە. لەوەیش زیـــاتر، وەک گەنەیەک لکاویـــت بەو کـــارە گەمـــژانەتەوە و

لێیــان نــابیتەوە، لە "ڕەگەز، چــین، نەتەوە، زۆرلێکردنــی ئــایینی و چەوســاندنەوەی خۆشەویســتی" نــابیتەوە؛ وەک چۆن ئەسپێ دەلکێت بە خورییەوە. تۆ زاتی ئەوەت نییە ببینیــت کە چەنــد بە قــووڵی لە زەلکــاوی بەدبەختییەکــانی خۆتــدا چەقیویــت، جــار نــا جــارێکیش ســەر لە زەلکــاو دەردەهێنیت و هاوار دەکەیت: "بژی." قیرەقیرِی بۆقێک لە گەڕاوێکدا لە تۆ زیاتر لە ژیانەوە نزیکترە.

"بــۆ لەم زەلکــاوە ڕزگــارم ناکەیــت و دەرمناهێنیــت؟ بــۆچی بەشــداریی ئەنجــومەنی حیــزبەکەم، پەرلەمانەکــانم، یــان کۆنفرانســە دیپلۆماتییەکــانم ناکەیــت؟ تــۆ ناپاکیــت! تــۆ لەپێنــاوی منــدا جەنگاویــت، ئــازارت چەشــتووە، قوربانیــت داوە کەچی ئێستا سووکایەتیم پێدەکەیت!"




جار نا جارێکیش سەر لە زەلکاو دەردەهێنیت و
هاوار دەکەیت: "بژی."

مـن نـاتوانم لەو زەلكـاوەی تیایـدا چەقیویـت دەرت بهێـنم. تـاکە کەسـێک کە بتوانێـت دەرت بکـات، خۆتیـت. هەرگیـز لە کـۆنفرانس و کۆبوونەوەکانـت بەشـداریم نەکـردووە، چـونکە هەمیشـە هـاوارت کـردووە: "بـڕوخێن شـتە بنچینەییەکـان" و "بـا لەسـەر شـتە لاوەکییەکـان بدوێین." ڕاستە بۆ ماوەی بیست و پێنج ساڵە لەپێناو تۆدا جەنگـام و خەبـاتم کـرد و دڵنیـایی و کـارەکەم و گەرموگـوڕیی نێـو خێـزانەکەمم کـردە قوربـانی، پـارە و پـوولێکی باشـم بەخشـییە ڕێکخراوەکانـت، لە خۆپیشـاندانەکانی دژ بە برسـێتیدا بەشـداربووم. ڕاسـتە، وەک پزیشکێک هەزاران کاتژمێرم لە کارەکەی خـۆمم پـێ بەخشـیویت بەبـێ ئەوەی هـیچ بەخشیشـێکم بوێـت. لەو کاتـانەی قوڕگـت بە هـاوارکردن و پیاهەڵـدان بەسـەر گەورەکانتدا دەنووساند، لەبەر تۆ وڵات بە وڵات گەڕام، لە شـەڕی بەرەنگـاربوونەوەی پەتـای سیاسـی ئامـادەبووم لەپێنـاوی تـۆدا گیـانم بەخـت بـکەم. ئەو کـاتەی ژیـانم لە مەترسـیدا بـووە، چەنـدین جـار ژیـانی تـۆم پاراسـتووە. لە کـاتی خۆپیشـاندانـدا منـداڵەکانتم لە هێرشـی پۆلیسـەکان پاراسـتووە. تەواوی پارەکـانم لە بنیادنـانی کلینکێکـی نەخۆشییە دەروونییەکاندا خەرج کـردن بـۆ ئەوەی لەوێـوە بتوانیت ڕاوێژ و یارمەتی بەدەست بهێنیت، بەڵام تـۆ تەنیـا لێـت دەبـردم و هەرگیـز لە بەرانـبەردا هـیچ شـتێکت پـێ نەبەخشیم. تۆ تەنیا ویستوتە پارێزراو بیت و خۆت ڕزگار

بکەیت. بەڵام لە درێژایی سی ساڵی تۆقێنەری نەخۆشیی دەروونیی سۆزداریدا هیچ بیرکردنەوەیەکی بەسوود و بەبەرهەمت نەبووە. کاتێک جەنگی جیهانیی دووەم کۆتایی هات، خۆتت لە هەمان شوێن بینییەوە کە بەر لە جەنگەکە تێیدا بوویت. لەوانەیە کەمێک زیاتر بەلای "چەپ"دا لات دابێت، تا "لای ڕاست،" **بەڵام یەک ملیمەتریش بەرەوپێش نەچوویت!** قومارت بە شۆڕشە گەورەکەی فەڕەنساوە کرد. تەنانەت شۆڕشی ڕووسەکانت کرد بە دێوەزمەیەک کە هەموو دونیا لێی بترسن. ئەم شکستە سامناکانەی تۆ، هەر دڵە تەنیا و مەزنەکان لێیان تێدەگەن بەبێ ئەوەی لێت تووڕە ببن، بەبێ ئەوەی سووکایەتیت پێ بکەن، کە نائومێدی بۆ تەواوی دونیا بەدواوەیە، کەچی ئەو بەشەی دونیا ئامادەیە لەپێناوی تۆدا هەموو شتێک بکات بە قوربانی. لەم نیو سەدە پڕ لە کوشتن و ترسێنەرەدا، تۆ تەنیا هەمان قسەکانی خۆتت دەوتنەوە، تەنانەت وشەیەکی ژیر و ماقوڵت دەرنەبڕی.

دڵم لەدەست نەداوە، چونکە لەو ماوەیەدا فێری ئەوە بووم کە چاکتر و قووڵتر لە نەخۆشییەکەت تێبگەم. ئێستا تێدەگەم کە تۆ ناتوانیت بە جۆرێکی تر، جیاواز لەوەی پێشتر کردووتە، بیربکەیتەوە یان هەڵسوکەوت بکەیت. لەنێو تۆدا ئەو هەستی مردنەم هەست پێ کرد کە بەرانبەر بە هەر شتێکی زیندوو لە خۆتدا هەتە. ترسێک کە هەمیشە وات لێ دەکات بە دروستی دەست پێبکەیت و

به چەوتی کۆتایی پێ بهێنیت. تۆ لەو زانست و زانیارییە تێناگەیت کە دەبێتە هۆی دروستبوونی "هیوا." تۆ تەنیا لە خۆتدا هیوا فوو دەدەیت، نەک ئەوەی لە خۆتی دەربکەیت، هەر بـۆیەیش لە دیـدی ئاسـتەنگەکانی جیهـانەکەتەوە، بە "گەشـبین" نـاوم دەبەیـت، بەڵـێ مـن گەشـبینم و پـڕم لە داهاتوو، بۆچی دەپرسیت؟ من پێتی دەڵێم:

هەتـا زیـاتر لێـت نزیـک بـبمەوە، بەوشـێوەیەی کە هەبوویـــت و هەیـــت، هێنـــدە زیـــاتر ڕووخســـارمت بە بیرتەسکیت کوتـاوەتەوە. ئەو کـاتەی کە یـارمەتیم داویـت، هەزاران جـــار ئەوەم لەیـــاد کـــردووە کە چیـــت لە دژم کـــردووە. هەزاران جـــاریش نەخۆشـــییەکەتت وەبیـــر هێناومەتەوە، تا ئەو کاتەی بەڕاستی چاوەکانم کردنەوە و پڕاوپـــڕ تەماشـــام کردیـــت، ســـەرەتا هەســـتکردن بە ســـووکایەتیت و ڕقلێبـــوونەوەت لە ناخمـدا هەڵقـوڵا، بەڵام بەرەبەرە فێـــــری ئەوە بـــــووم کە تێگەیشـــــتنم لە نەخۆشـییەکەت ڕێگـر ببێـت لە ڕقلێبـوونەوەت و، چیتـر بەرانبەر ئەو هەڵە ترسناکانەی کە ئەنجامی دەدەیت، لێت تـووڕە نەبـم. لە یەکەم هەوڵـدانت بـۆ بەڕێـوەبردنی دونیـا، لەوە تێگەیشتم کە ئەمانە شتێکن هەر دەبێت ڕوو بدەن و، ناتوانیـت بەریـان پـێ بگریـت، چـونکە هەزاران ســاڵە بێبەشکراویت لەو ژیانە زیندووەی کە هەیە.



**تا ئەو کاتەی بەڕاستی چاوەکانم کردنەوە و**
**پڕاوپڕ تەماشام کردیت**

ئەی پیـاوی گـولانە! مـن یاسـای فرمـانیی ژیـانم دۆزییەوە کاتێک کە دەوروبەرت پڕ کردبوو لە هـاواری: "شێتە!" لەو کاتەدا تۆ دەروونپزیشکێکی بچووک بوویت، بە ڕابـردوویەک لەنێـو بزێـوی گەنجـانەدا و نەخۆشـیی دڵیش لە داهاتوودا چاوەڕێت دەکات، ئەوە بۆیە لەپیاوێتی کەوتیـت. دواتـر بە دڵێکـی شـکاوەوە گیانـت لەدەسـت دا، ئەگەر کەسێک کەمێک ڕاستگۆیی تێدابێت، کەسێک بدزێت و لە پاشملە ناوی کەسێک بزڕێنێت، لە سزادان ڕزگاری نابێت. پیاوی بچووک! تۆیش لە قوژبنێکی ڕۆحتدا ئەوەت تێدا بوو. کاتێک تۆ لە هـاوڕێوە بوویت بە دوژمـنم، وات هەست کرد کۆتاییم پێ هاتووە و هەوڵتدا دوا شـەقم تێ هەڵبدەیت، چونکە دەتزانی من لەسەر ڕاستیم و لە تواناتدا نییە دوام بکەویت. کاتێکیش چەند ساڵێک دواتر بەهێزتر و بە بڕوایەکـی پتەوتـر لە پێشـتر گەڕامەوە، تۆقیـت و لە ترسدا مردیت، چونکە پێش مردنت بۆت دەرکەوتبوو کە من بەسەر هەموو ئەو چاڵە قووڵ و فراوانانەدا کە بۆت هەڵکەندبووم تـاکو لەنـاوم ببەیـت، بـازم داوە و دەربـازم بووە. ئەوە تۆ نەبوویت لە ڕێکخراوەکەتدا تێروانینەکانی منت بە هیی خۆت ناساندبوون؟ پێت دەڵێم: کەسە ژیر و ڕاستگۆکانی نێو ڕێکخراوەکە ئەمەیان زانیبوو؛ منیش بۆیە پێم زانیویت، چونکە ئەوان بۆیان گێڕامەوە. نـا، پیـاوی بچووک! بەکارهێنانی تاکتیکەکان تەنیا پێشوەختە دەتنێنە گۆڕەوە.

لەبەر ئەوەی تۆ مەترسییت بۆ ژیان، لەبەر ئەوەی تۆ ناتوانیت لە حەقیقەت نزیک ببیتەوە بێ ئەوەی ترست لەوە هەبێت کە لە پشتەوە شمشێرت لێ نادرێت، بۆیە خۆم لە تـۆ دوور خســتووەتەوە. دووپـاتی دەکەمەوە: نەک لە داهاتووت، بەڵکو خۆمم لە ئێستایشت دوور خستووەتەوە؛ نەک لە مرۆڤایەتیـت، بەڵکـو خـۆمم لە نامرۆڤیـت و بچووکیت دوور خستووەتەوە.

تەنیـا لە پێنـاوی زینـدوویێتیی ژیانـدا ئامـادەم هەمـوو قوربـانییەک بـدەم، بەڵام پیـاوی بچـووک! چیتـر لەپێنـاوی تـۆدا قوربـانی نـادەم. مـاوەیەکی زۆر کەم بەر لە ئێسـتا درکم بە هەڵەیەکی گەورە کرد کە بیستوپێنج ساڵ کاتم پێوە بەسـەر بـردووە: خـۆمم بـۆ تـۆ و ژیانـت تەرخـان کردبـوو، چـونکە بـڕوام وا بـوو تـۆ زینـدوویێتیی ژیـان و دادپەروەری و داهاتوو و هیوایت. هاوشێوەی من چەندان خەڵکـی دادپەروەر و ڕاسـت هیوایـان خواسـتووە و زیندوویێتیی ژیان لە تۆدا بدۆزنەوە، هەر هەموویان لەناو چوون، دوای ئەوەی ئەوەم بۆ دەرکەوت، بڕیارم دا لەژێر بچووکی و نزمیی تۆدا لەناو نەچم، چونکە من چەندین کاری گرنگم هەیە دەبێت ئەنجامیان بدەم. پیاوی بچووک! مـن ژیـانم نەدۆزیـوەتەوە، چیتـر تـیکەڵ بەو زینـدوویێتیی ژیانەت ناکەم کە لە خۆمدا هەستم پێ کردووە و، لە تۆدا بۆی گەڕاوم.

تەنیا ئەگەر بە ڕوون و ڕاسالّی[1] خۆم لە ژیان و کردار و تایبەتمەندی و چۆنیەتیی ژیانت جیا بکەمەوە، ئەوسا دەتوانم هاوبەشێکی ڕاستەقینەی پێداچوونەوەی ژیان و داهاتووت بم. دەزانم دەستلێهەڵگرتن و وازلێهێنانت زاتی دەوێت، بەڵام دەتوانم لە کارکردن بۆ داهاتووت بەردەوام بم، چونکە من بەزەییم پێتدا نایەتەوە، چونکە من ئەو ویستەم نییە تا ببم بە پیاوێکی مەزنی گرگن، وەک سەرگەورە بەدبەختەکانت.

زۆر نابێت زیندوێتی یاخی بووە، ئەوەیش کاتێک لەلایەن تۆوە بە هەڵە بەکار هێنرا. ئەمە دەستپێکێکی مەزنە بۆ داهاتووە مەزنەکەت و، کۆتاییەکی ترسێنەرە بۆ ئەو هەموو هیچوپووچی و بێنرخییەی بە بەر هەموو پیاوانی بچووکدا کراوە. چونکە لەو کاتەدا درکمان بەوە کرد کە دەردە هەستی و سۆزدارییەکان چۆن کار دەکەن. کاتێک بڕیاری دابوو پەلاماری پۆلەندا بدات، پۆلەندای بە نیازی دەستدرێژیی سەربازی تۆمەتبار کرد. کاتێک بڕیاری دابوو ڕکابەرەکەی بکوژێت، بەوە تۆمەتباری کرد کە نیازی وابووە ئەم بکوژێت. کاتێک دەیەوێت هەندێک تاوان ئابڕووبەرانە ئەنجام بدات، ژیانی تەندروستانە بە پیسبوونی سێکسی تۆمەتبار دەکات.

---

[1] ڕاسالّی: سەرڕاستی

پیـــاوی بچـــووک! یەکێـــک پەردەی لەســـەر ڕووت هەڵماڵیوە؛ یەکێکی تر تۆی ئەو کاتانە بینیوە کە داماو و شایەنی بەزەیی بوویت. یەکێکی تر دەیەوێت بڕیار لەسەر بە کـار و دەسـتکەوتەکان بڕیـار لەسـەر ڕەوتـی دونیـا بـدەیت. یەکێکـی تـر نایەوێـت سـتەمکار و زۆردارێـک بە سـتەمکار و زۆردارێکـی تـر بگـۆڕێتەوە. یەکێکـی تـر دەیەوێت توندتر خۆت بدەیت بەدەست یاسـاکانی ژیـانەوە، وەک ئەوەی خـۆت لە خەڵکـانی تـری داوا دەکەیـت و پەرە بە خۆت بدەیت وەک ئەوەی ڕەخنە لە کەسانی تر بگریت. یەکێکـی باشـتر لە قسـەهێنان و بـردن و چڵێسـی و خـۆدزینەوە لە بەرپرسـیارێتی دەتناسـێتەوە. بە کـورتی نەخۆشییەکەت بۆنی ئەم دونیا جوانەی نـاخۆش کردووە. دەزانـم ناتەوێـت ئەمـانە ببیسـتیت، دەتەوێـت وەک ئەو کەسـەی کە داهـاتووی کرێکـارانی یـان رایخـی چـوارەمی هەڵگرتـووە، "بژی! بژی!" ببیسـتیت. بەڵام بڕوام وایە ئەو سـەرکەوتنە بەدەست ناهێنیت کە لە ڕابردوودا بەدەستت هێنـاوە. ئـاخر پیـاوی بچـووک! ئـێمە کلیلـی نهێنییەکـانی هەزاران سـاڵی تۆمـان دۆزیـوەتەوە. تۆ لە پشت دەمـامکی کـۆمەڵایەتی و دۆسـتایەتیتەوە دڕنـدە و بەدکاریـت. تـۆ ناتوانیت نیو ڕۆژ لەگەڵ مندا بەسـەر ببەیـت. بەبێ ئەوەی خـۆت بناسـیت، بـڕوام پـێ ناکەیـت؟ بـا یـادەوەری نـوێ بکەمەوە:

ئەو دوانیـــوەڕۆ جــوانەت لەیـــادە، ئەم جــارە وەک داربڕێک هاتیت بۆ کابینەکەم و بەدوای کاردا دەگەڕایت؟ تــوولەکەم بــۆنی کردیــت و بە خۆشــییەوە لەبەردەمتــدا هەڵبەز و دابەزی دەکرد. تێبینــی ئەوەت کــرد کە دەکرێت ئەو تــوولە ســەگە ببێت بە ســەگێکی ڕاوی بــاش و وتــت: "بۆچی بە زنجیر نایبەستیتەوە تـا ببێت بە سـەگێکی دڕ؟" منـیش وتـم: "ئەم سـەگە لەگەڵ خەڵکیـدا فـرە دۆسـتانەیە، نامەوێــت ببێــت بە ســەگێکی دڕ و بەزنجیربەســتراو. مــن سەگی دڕم ناوێت کە ڕقی لە خەڵکی بێت." داربڕە ئازیزە کـزگلەکە! لە دونیــادا لە تــۆ زیــاتر دوژمــنم هەیە، بەڵام هێشـــتا ســـەگێکی میهرەبـــان و دۆســـتانەم دەوێـــت کە هاوڕێیەتیی هەموو کەسێک بکات.



تۆ لەپشتەوە ڕووبەندی کۆمەڵایەتیبوون و
دۆستایەتیبووونتدا دڕندەیت

ئەی ئەو یەکشـــەممە بارانــاوییەت بیـر مــاوە کاتێـک بێئـۆقرەییم ســـەبارەت بە وشـکهەڵاتوویی جەسـتەت وای کرد لێکۆڵینەوەکەم جێ بهێڵم و ڕووو بکەمە مەیخانەیەک؟ لەســـەر مێزێـــک دانیشـــتم و داوای پێکێـــک ویســـکیم کرد؟(نەخێر پیاوی بچووک! من کەسێکی مەیخۆرەوە نیم، هەرچەنـدە جـار نـا جارێـک حەز بە خـواردنەوە دەکەم.) بەهەر حـاڵ، پێکێکم لە بەردەستدا بـوو. زۆر نەبـوو تۆ لە دوور وڵات گەڕابـوویتەوە، تۆزێـک مەسـت بووبوویـت، گوێم لـێ بـوو یابانییەکانت بە "مەیمـوونی دزێـو" وەسـف دەکرد. جـا هەنگینـێ بە ڕوانینێکەوە کە زۆرباش لە کـاتی چارەســـەرکردندا بینیـومە، وتـت: "دەزانـــن دەبێـت چـی بەرانـــبەر بەو مەیموونـــانەی کەنـــاری خۆرئـــاوا بکرێـت؟ دەبێت دانەبەدانەیـان هەڵبواسـرێن، بە پەلە نـا، بەڵکو زۆر بە هێواشی، پێنج خولەک جارێک دانەیەکیان هەڵبواسرێت و بخنکێنرێـــت، زۆر بە هێواشـــی و بەو شـــێوەیە..." بە دەسـت جـووڵەکەت نیشـان دان کە چـۆن ئەنجـام بـدرێت. مەیگێڕەکەیش سـەری بـۆ لەقاندیت و ڕێزی لە پیـاوەتییە پاڵەوانانەکەت گرت.

هـۆ نیشـتمان پەروەرە بچـووکەکە! هەرگیـز منداڵێکی تـــازەلەدایکبووی یابانیـت لەئـــامێز گرتـــووە؟ نەخێـر؟ بە درێژایـی چەنـد ســـەدەی کە دێـت، تـۆ شـۆفارە یابـانی و ئەمێریکاییەکان و ژنە جوتیارە ڕووسـییەکان و ئەفسـەرە ئەڵمانییەکـــان و ئینگلیـــزە ئاژاوەچییەکـــان و کۆمۆنیســـتە

یۆنانییەکـان هەڵدەواسـیت و تەقەیـان لـێ دەکەیـت و دەیانکوژیت و لەسەر کورسیی کارەبایی و لەنێو ژووری گازەکانـدا دایـان دەنێیت، بەڵام هـیچ کـام لەمـانە قەبزیـی هەناو و بیرکردنەوە و مێشکت و، نەتوانینی خۆشەویستی و نەخۆشیی ڕۆماتیزم و نەخۆشیی دەروونـی نـاگۆڕن. نە کوشـتن نە هەڵواسـین لەو زەلکـاوە دەرتنـاهێنن کە تیایـدا چەقیویـت و بەدەسـتیەوە دەناڵێنیـت. پیـاوی بچـووک! تەماشایەکی خۆت بکە، ئەوە تاکە هیواتە.

ئەو ڕۆژەت لە  یادە ژنـی بچـووک! لە ژوورەکەمـدا دانیشـتبوویت و، بەرانـبەر بەو پیـاوەی کە لێـت جیابووبووەوە پڕ بوویت لە ڕق و کینە؟ کە بۆ سـاڵانێک لەژێر کۆنترۆڵی خـۆت و دایکت و پوورەکانت و بـرازا و خوشکەزاکانت و ئامۆزاکانتدا بوو، تا خەریک بـو بخنکێت؛ چـونکە دەبـوو ئاگـای لە خـۆت و خزمەکانیشـت بێـت. دواجـار، لە کۆتاییـدا هەوڵـی دا هەسـتەکانی بەرانـبەر بە ژیان بپارێزێت و خـۆی لە دەسـتان ڕزگـارکرد. هێنـدەیش بەهێـز نەبـوو تـا بتوانێت لەبەرانـبەر تـۆدا ئـازادیی نـاخی بەدەست بهێنێت، ئەوە بۆیە هانای بۆ مـن هێنـا. ئامـادەبوو خەرجیی بژێوی تۆ، کە سێ بەشی داهـاتەکەی بـوو، بـدات کە بە یاسـا دیـاری کرابـوو، وەک سـزایەک بـوو بـۆ ئەو ئەوینـەی بـۆ ئـازادی هەیبـوو، چـونکە ئەو هونەرمەنـدێکی مەزن بـوو، هـونەریش زانسـتێکی ڕاسـتەقینەیە و بەرگەی هـیچ کـۆت و بەنـدێک ناگرێـت. بەڵام هەمـوو ئەوەی تـۆ

دەتخواست، ئەوە بوو ئەو پیاوەی کە زۆر ڕقت لێ دەبوویەوە، ئاگای لێت بێت. سەرباری ئەو ڕاستییەی کە تۆ بۆ خۆت پیشەیەکت هەبوو، تۆ دەتزانی کە من یارمەتیی دەدەمتا لە دەست ناچارکردنێکی نادادپەروەرانە ڕزگاری ببێت، بۆیە دەهری بوویت، بە پۆلیس هەڕەشەت لێ کردم و پێت وتم: "بە سوودوەرگرتن لەوەی کە زۆر پێویستیی بە یارمەتی هەیە، دەتەوێت هەموو سامانەکەی ببەیت." بە واتایەکی تر، هەی ژنی بچووکی داماو! هەرچی بە مێشکتدا هات، منت پێ تۆمەتبار کرد. بەڵام تۆ هەرگیز بیرت لەوە نەکردووەتەوە لە کارەکەتدا پەرە بە خۆت بدەیت، بەو مانایەی ئازاد بیت، ئازاد بییت لەو پیاوەی کە بۆ ماوەی چەند ساڵێک ڕقت لێ دەبوویەوە. پێت وایە بەم ڕێگایە دەتوانیت دونیایەکی نوێ بنیاد بنێیت؟ بیستم چەند ئاشنا و هاوڕێیەکی سۆسیالیستت هەبوونە کە "هەموو شتێکیان سەبارەت بە من دەزانی." ئەوە نابینیت کە تۆ "جۆر"ێکیت و ملیۆنانی هاوشێوەی تۆ هەن کە ئەم دونیایە کاول دەکەن؟ دەزانم"لاواز" و "تەنیا"یت و "بە دایکتەوە لکاویت،" و، "بێ چارەیت،" ڕقت لە خۆتە، بەرگەی خۆت ناگریت و داهێزراویت. هەر لەبەر ئەمەیشە ژیانی مێردەکەتت شێواندووە. ژنی گزگل! لەو تەوژمی ژیانەی ئەمڕۆدا مەلە دەکەیت کە بە شێوەیەکی گشتی باوە. ئەوەیش دەزانم کە دادوەران و پارێزەرانت لەپشتن، ئەوە

بۆیە هیچ وەڵامێکیان بۆ ئەو کڵۆڵییە نییە کە تێی کەوتوویت.

هێشتا دەتبینم ژنی بچووک! کە لە یەکێک لە باڵەخانەکانی دادگای فیدراڵیت، سەبارەت بە ڕابردوو و ئێستا و بیروڕاکانم لەسەر موڵکایەتی و ڕووسیا و دیموکراسی دەنووسیت. لەلایەن دادوەرەکانتەوە سەبارەت بە پێگەی کۆمەڵایەتیم پرسیارم لێ دەکرێت. دەڵێم ئەندامی فەخریی سێ کۆمەڵەی زانستی و ئەدەبیم، لەنێویاندا کۆمەڵەی پلازمۆجینی نێودەوڵەتی. ئەمە شتێکی جوان دیارە. جاری داهاتوو بەرپرسەکە دەڵێت: "لێرەدا شتێکی سەیر و جێی گومان هەیە. نووسراوە تۆ ئەندامی فەخریی کۆمەڵەی فرەژنیی نێودەوڵەتیت. ئەوە ڕاستە؟" هەردووکمان بەو هەڵە بچووکە پێدەکەنین، ژنە بچووکە خەیاڵاوییەکە! ئێستا لەوە تێدەگەیت کە بۆچی خەڵکی شتی بەدکارانە سەبارەت بە من دەڵێن؟ بە هۆی خەیاڵەکانی تۆوەیە، نەک ئەو شێوازی ژیانەی من گرتوومەتە بەر. ئایا ئەوەی تۆ سەبارەت بە ڕۆسۆ بیرت ماوە، ئەوە نییە کە دەیویست بگەڕێتەوە بۆ "سروشت" و منداڵەکانی پشتگوێ خستن و ڕەوانەی هەتیوخانەی کردن؟ ئاخر تۆ زۆر دزێویت، چونکە تۆ تەنیا ناحەزی و بەدییەکان دەبینیت و دەبیستیت نەک جوانییەکان.

"گوێم بۆ ڕادێرن! بینیومە کاتژمێر یەکی شەو پەردەی ژوورەکەی لاداوە. پێتان وایە لە کاتێکی وادا

خەریکی چییە؟ ئاخر بە درێژایی ڕۆژ پەردەی ماڵەکەی دادراوەتەوە. دەبێت شتێک لەمەدا هەبێت!"

چیتر یارمەتیت نادەم کە ئەو شێوازانە بۆ دژایەتیکردنی حەقیقەت بەکار بهێنیت. ئێمە ئەو شتانە دەزانین. پەردەی ماڵەکەم هیچ بەلاتەوە گرنگ نییە، کۆسپهێنانە بەردەم ڕاستییەکەم بەلاتەوە گرنگە. تۆ دەخوازیت وەکوو شۆفار و ناوزڕێنەری مرۆڤەکان بەردەوام بیت، پیاوی بچووک! دەتەوێت دراوسێ بێتاوانەکەت بخەیتە کونجی زیندانەوە بە تەنیا لەبەر ئەوەی ئەو شێوازی ژیانەیت بە دڵ نییە کە بۆ خۆی هەڵی بژاردووە، لەبەر ئەوەی ئەو ئازادە یان میهرەبان و دڵسۆزە، یان کار دەکات و هیچ گرنگییەک بە تۆ نادات. تۆ زۆر لاپرەسەنیت[1]. لەسەر ورگی خەڵک دەژیت و ناویان دەزڕێنیت و تۆمەتیان بۆ هەڵدەبەستیت. بەو ڕاستییە پارێزراویت کە پۆلیسەکان ناسنامەی شۆفارەکانی خۆیان ئاشکرا ناکەن.

"گوێ بگرن، باجدەران! ئەو پرۆفیسۆری فەلسەفەیە، زانکۆیەکی گەورەی شارەکەمان دەیەوێت دابیمەزرێنێت تا وانە بە گەنجەکانمان بڵێتەوە. ڕسوا بێت!"

---

[1] لاپرەسەن: خۆهەڵقورتێن. فزوول

کابان و باجدەرە سەربڵندەکانت نارەزایەتی و سکاڵا لە دژی ئەو مامۆستای ڕاستییە دەردەبڕن و، ئەو پلەیەی نادریتی. تۆ ئەی کابانی باجدەر و هەڵگری شکۆی نیشتمانپەروەری، تۆ لە چوار هەزار ساڵی فەلسەفەی سروشتی بەهێزتر بوویت. بەڵام خەریکە لێت تێدەگەن، درەنگ یان زوو کۆتاییت پێ دەهێنرێت.

"گوێ بگرن، هۆ ئەوانەی ڕەوشتی گشتیتان بەلاوە گرنگە! لە سوچی کۆڵانەکەدا دایکێک لەگەڵ کچەکەیدا دەژی. جا کچەکە ئێوارانێکی درەنگ کوڕە دۆستەکەی دەبینێت! دەبێت دایکی بدەنە دادگا، چونکە ماڵەکەی کردووە بە جندەخانە! پۆلیس بانگ بکەن، دەمانەوێت ڕەوشتمان پارێزراو بێت!"

ئەو دایکە سزا دەدرێت، چونکە تۆ، پیاوی بچووک، خۆت لە جێگای نوستنی ماڵی خەڵکی دا هەڵدەقورتێنیت. تۆ زۆر بە ڕوونی خۆتت نیشان داوە. هاندانەکانی تۆ بۆ "ڕەوشت" و "یاسا" دەبینن. مەگەر تۆ لەپشتەوە دەست بۆ شاگردە کچەکان نابەیت، پیاوە بچووکە بەڕەوشتەکە؟ بەڵێ، ئێمە دەمانەوێت کچ و کوڕەکانمان لە خۆشەویستیدا ئاسوودە و دڵخۆش بن، نەک مینا تۆ بە نهێنی لە کۆڵانە تاریکەکاندا بچنە ژووانی خۆشەویستەکەیان. دەمانەوێت ڕێز لەو دایک و باوکە ئازا و لێهاتووانە بگرین کە لە خۆشەویستیی کوڕ و کچە لاوەکانیان تێدەگەن و دەیپارێزن. ئەو دایک و باوکانە هەوێنی نەوەی نوێی

داهاتوون، بە جەستە و هەستێکی تەندروستەوە، وەک تۆ شـــوێنەواری خەیـــاڵی چەپەڵیـــان نیـــیە، هـــۆ پیـــاوە کەمکاژێربووەکەی سەدەی بیست.

"گـوێ بگـرن، بـا تـازەترین شـتتان بـۆ بگێـڕمەوە! پیـاوێکی گەنـج بـۆ مەبەسـتی چارەسـەر چـوو بـۆلای ئەم، لەبەر ئەوەی دەسـتدرێژیی سێکسـیی کردبـووە سـەری، ناچـار بەبـێ ئەوەی پـانتۆڵەکەی هەڵبکێشـێت؛ لەدەسـتی هەڵهاتبوو!"

پیاوی بچووک! ئەرێ لیکی فـارزکی[1] بەدەمتدا نـایەتە خوارێ کاتێک "چیرۆکی ڕاستەقینە" دەگێڕیتەوە؟ دەزانیت ئەمە دەرئەنجامی قەبزی و ئارەزووی فارزکیی خۆتە؟ من ببڕای وەک تۆ پەرۆشی هاوڕەگەزبازی نەبووم؛ هەرگیز وەک تـــۆ ئـــارەزووی لەخشـــتەبردنی کچـــانی گەنجـــم نەکردووە؛ بە هیچ جۆرێک مینا تۆ دەستدرێژیی سێکسیم نەکـردووەتە سـەر ژنـان؛ هەرگیـز چـوون تـۆ بە دەسـت قەبـزییەوە نەمناڵانـدووە؛ ببـڕای وەک تـۆ خۆشەویسـتیم نەدزیـــوە، تەنیـــا ئەو کـــاتە ئامبـــازی ژن بـــووم کە ئەو خواستی لەسـەر بووبێت و منیش خواسـتم لێی بووبێت؛ هەرگیـز وەکـوو تۆ لە بەرچـاو خەڵکدا خـۆم نەنوانـدووە؛ وەکوو تۆیش خەیاڵی چەپەڵم نییە، پیاوی بچووک.

---

[1] فارزکی: شەهوەتی سێکس

"گوێ لەمە بگرن: ئەو هێندە سکرتێرە کچەکەی بێزار کرد تا ناچاری کرد لەماڵەکەی ڕابکاتە دەرەو.، لە ماڵێکدا لەگەڵی دەژیا، ماڵێک تا کاتژمێر سێی بەیانی پەردەکانی داددرانەوە و گڵۆپەکانی ئیشیان دەکردا"



ڕەوشتخوازێکی چەپڕەو بەدوای وزەی ئۆرگۆندا
دەگەڕێت

سەبارەت بە دی لامیتریێ وتت: "لامیتریێ کەسێکی دڵچەرێن[1] بوو تا خواردن خنکاندی" و؛ لەبارەی ڕۆدۆلفی شازادەوە وتت: "ژنێکی لە پلەیەکی کۆمەڵایەتیی نزمتری کردووە بە هاوسەری خۆی؛" یان وتت: "خاتوو ئیلیانۆر ڕۆزڤێڵت ژنێکی تەواو ڕێکوپێک نەبووە و؛ وتت: "سەرۆکی یەکێک لە زانکۆکان ژنەکەیی لەگەڵ پیاوێکدا گرتووە و؛ مامۆستای قوتابخانەی ئەم یان ئەو گوند خۆشەویستی هەیە." هەموو ئەوانەت وتووە پیاوی بچووک؟ تۆ هاووڵاتییەکی کڵۆڵی ئەم دونیایەیت کە هەزاران ساڵە ژیانی خۆتت دۆڕاندووە. بەمشێوەیە لەو زەلکاوەدا دەمێنیتەوە کە تیایدا چەقیویت.

"بیگرن، ئەو شۆفارێکی ئەڵمانییە یان لەوانەیە ڕووسی یان ئێرلەندی بێت! کاتژمێر سێی دوا نیوەڕۆ لە شەقامی 86 لە نیۆرک بینیومە و، ژنێکیشی لەگەڵدا بوو!"

پیاوی بچووک! ئایا دەزانیت جوجە[2] لە بەر تیشکی ڕووناکیی باکووردا چۆن دەردەکەوێت؟ نەخێر؟ لەو بڕوایەدا نیم بزانیت. ڕۆژێک دێت یاساگەلی بەهێز بەرانبەر بە جوجەبوونی مرۆڤ دادەنرێن، چەند یاسایەکی

---

[1] دڵچەرێن: خۆشگوزەران و تۆڵاز

[2] جوجە: جۆرە قۆلانچەیەکی بچووکی سوورە، خوێن دەمژێت و، بە مرۆڤدا هەڵبگەڕێت، لیر دەکات.

توند بۆ پاراستنی ڕاستی و خۆشەویستی. هەر وەک چۆن ئەمڕۆ لاوە ئەویندارەکانت لەو خوێندنگایانە داناوە کە مەبەست لێیان چاکسازییە، ڕۆژێک دێت لەبەرئەوەی مرۆڤەکان پیس و لەکەدار دەکەیت، تۆ بخرێیتە ئەو دامەزراوانەوە و دادوەر و پارێزەر هەبن پارێزگاری لە دادپەروەریی ساختە و لەقالبدراو نەکەن و پارێزگاری لە میهرەبانی و دادپەروەریی ڕاستەقینە بکەن. سەردەمێک دێت کە چەند یاسایەکی توند دابنرێن بۆ پاراستنی ژیان و، تۆیش ناچاربیت ملکەچیان بیت و پەیڕەویان بکەیت، گرنگیش نییە کە تۆ چەند ڕقت لەو یاسایانە دەبێتەوە. دەزانم بۆ چەند سەدەیەکی تریش بەردەوام دەبیت لەوەی هەڵگری دەردی سۆزداری ، ناوزڕاندن و فێڵ و تەڵەکە، دیبلۆماسییەت و لێپرسینەوە بیت. بەڵام لەکۆتاییدا خۆت دەدەیتە دەست هەستی پاکبوونەوە، کە ئێستا لە قووڵایی ناختدا ناشتووتە و دەستت نایگاتێ.

پێت دەڵێم هیچ قەیسەرێک، هیچ تسارێک، هیچ باوکێک لە باوکەکانی کرێکاری نەیتوانیوە تۆ داگیر بکات، ئەوان تەنیا توانیویانە بتکەن بە کۆیلە. بەڵام هیچ کامیان نەیانتوانیوە لە بچووکی و بێنرخیت کەم بکەنەوە، ئەوەی تۆ داگیر دەکات تەنیا هەستەکانتە بۆ پاکبوونەوە و پەرۆشیتە بۆ ژیان. پیاوی بچووک! هیچ گومانێک لەمەدا نییە. بە پاکبوونەوە لە بچووکی و بێنرخیت، دەست بە بیرکردنەوە دەکەیت. ڕاستە ئەم بیرکردنەوەیە لە

سەرەتادا لاواز و پڕ لە هەڵەیە و بێ ئامانجە، بەڵام تا دێت بەڕاستی بیر دەکەیتەوە. دەبێت ناچار بیت فێری ئەوە ببیت بەرگەی ئەو ئازارانە بگریت کە ئەو بیرکردنەوە لەگەڵ خۆیدا دەیانهێنێت. هەر وەک چۆن من و کەسانی تر چەند ساڵێک بە بێدەنگی و دانجیڕکردنەوەوە بەرگەی ئەو ئازارانەمان گرتووە کە بەدەست بیرکردنەوە لە تۆ چەشتوومانە. ئەم ترسەی ئێمە وات لێ دەکات بیر بکەیتەوە. هەر کە دەستت بە بیرکردنەوە کرد، ناتوانیت بەر بەو سەرسوڕمانەت بگریت کە بەرانبەر بە چوارهەزار ساڵی "شارستانەت" هەتە. ناتوانیت لەوە تێنەگەیت کە چۆن ڕۆژنامەکانت سەبارەت بە هیچ شتێک نەیاننووسیوە، جگە لە نمایش و ڕازاندنەوە و کوشتن، هەڵواسین و تەپکەی[1] دیبلۆماسی و فێڵبازی و خۆپڕچەککردن و خۆپڕچەککردنەوە و دیسانەوە خۆپڕچەککردنەوە و مەشقی سوپا و بۆردوومانکردن، شتێکی تریان تێدا نەنووسراوە، هەموو ئەوانە وایان نەکرد لە خەفەتدا بتەقیت. ڕەنگە بێیت و لەوە تێبگەیت کە تۆ هیچت نەکردووە، جگە لەوەی وەک مەڕێکی بەئارام هەموو ئەو شتانەت قووت داوە. بەڵام ئەوەی کە ناتوانیت پەسەندی بکەیت، ئەوەیە کە بۆ ماوەیەکی دوور و درێژ و بۆ چەند سەدەیەک وەکوو مەیموون و تووتی هەموو ئەو

---

[1] تەپکە: تەڵە، داو

شـــتانەت پـــاتە[1] کـــردوونەتەوە و وتـــوونەتەوە و وات بیرکـردووەتەوە کە بیرکـردنەوە ڕاسـتەکانت سـەبارەت بەوە، هەموویـان هەڵە بـوون. پێـت وابـووە بیرکـردنەوە هەڵەکـانیش نیشــتمانپەروەرانە بــوون. بەرانــبەر بەو مێـژووەی کە هەتە هەسـت بە شـەرمەزاری دەکەیـت و، ئەمەیش تاکە هیوایە کە نەوەکانمان لەوە پارێزراو دەبن مێـژووە سـەربازییەکەت بخـوێننەوە. چیتـر بـۆت نـالوێ شۆڕشێکی مەزن بەرپا بکەیت تەنیا بۆ ئەوەی بۆ "پیتەری مەزن" بگەڕێیتەوە.

ڕوانینێک بۆ داهاتوو:

من ناتوانم پێت بڵێم داهاتووت چۆن دەبێت، ناتوانم ئەوە بـزانم بەو وزەی ئۆرگـۆنەی کە مـن دۆزیـومەتەوە، دەگەیتە سەر مانگ یان مەریخ. ئەوەیش نازانم کەشتییە ئاسمانییەکان چۆن دەفڕن و چۆن دەنیشنەوە؛ یان ئاخۆ لە بە شەودا تیشکی خۆر بۆ ڕووناککردنەوەی ماڵەکەت بەکـار دەهێنیـت؛ یـان لەڕێـی دەلاقەیەکـی دیـواری هۆدەکەتەوە لە بەغدادەوە لەگەڵ ئوسترالیا قسە دەکەیت. بەڵام دەتوانم ئەوەت بڵێم تا پێنجسەد یان هەزار یان پێنج هەزار ساڵی تر نایکەیت.

---

[1] پاتە: بارە(دووپات: دووبارە، سێپات: سێبارە)

"گـوێ لەم خەیـاڵپلاوە بگـرن! ئەوەم پێـدەڵێت کە چ شتێک ناکەم! ئایا ئەو دیکتاتۆرە؟"

هــۆ پیــاوی گــرگن! مــن دیکتــاتۆرنیم. هەرچەنــدە بچووکیت ئەوەی بۆ ئاسان کردووم تا ببم بە دیکتاتۆر. دیکتاتۆرەکانت تەنیا دەتوانن ئەوەت پێ بڵێن کە ناتوانیت چی لە ئێستادا بکەیت بەبێ ئەوەی بنێردرێیت بۆ ژووری گـاز، وەلـێ نـاتوانن ئەوەت پـێ بڵـێن کە لە داهـاتوویەکی دووردا چـی دەکەیـت، چەنـدە دەتـوانن وابکەن درەختێـک خێراتر گەشە بکات، هێندەیش دەتوانن ئەوەت پێ بڵێن.

"ئەم ژیــرییەت لەکــوێ هێنــاوە، هەی خزمەتکــارە ڕۆشنبیرەکەی کرێکارانی شۆڕشگێڕ؟"

لە قـــــووڵایی نـــــاخی تـــــۆوە، ئەی کرێکـــــارە هەمیشەییەکەی ئاوەزی مرۆڤایەتی.

"گـوێ لەمە بگـرن، ئەو ژیرییەکـی لە قـووڵایی نـاخی مـنەوە وەرگرتـووە، مـن هـیچ قـووڵاییەکم نیـیە. ئـای "قووڵایی" چ وشەیەکی تاکە کەسییە!"



توانایی کاژێری؟ لەوانەیە

بەڵێ، پیاوی بچووک، تۆ "قووڵایی"ت هەیە، تەنیا ئەوەیە لێی بێئاگایت. لە ترسی ناخت زندەقت چووە، هەر لەبەر ئەمەیشە هەستی پێ ناکەیت یان نایبینیت. هەر لەبەر ئەمەیشە کاتێک تەماشای قووڵاییەکەت دەکەیت، تووشی سەرسوڕان دەبیت و بەمەلاو بەولادا دەکەویت، وەک ئەوەی لەسەر لێواری شیوێکدا ڕاوەستا بیت. لەوە دەترسیت کاتێک بە نیازێکی پاک بۆ گەیشتن بە خۆت دەڕۆیت، بکەویتە خوارەوە "تاکەکەسیت" لەدەست بدەیت. بەڵام دەگەڕێیتەوە و هەمان پیاوی بچووک و بەد و چاوتێبڕ و چڵێس و دزڕەفتاریت. پیاوی بچووک! ئەگەر خاوەنی قووڵایی نەبوویتایە، ئەوا ئەم قسانەم بۆ نەدەنووسیت. ئەو قووڵاییەی ناخت دەناسم، چونکە ئەو کاتە دۆزیومەتەوە کە وەک پزیشکێک بە دڵەڕاوکێوە دەهاتیت بۆ لام. قووڵایی ناخت داهاتووی مەزنی تۆیە، هەر بۆیە دەتوانم بەوپەڕی دڵنیاییەوە پێت بڵێم لە داهاتوودا چی ناکەیت. چونکە تۆ ناتوانیت لەوە تێبگەیت چۆن هەمان ئەو شتانەی لە سەردەمی دواکەوتوویی چوار هەزار ساڵ پێش ئێستادا ئەنجامت داون و ئەنجامت داونەتەوە. ئایا ئێستا دەتەوێت گوێ بگریت؟

"زۆر باشە، بۆچی گوێ لە چیرۆکێکی خەیاڵیی جوان نەگرم؟ دکتۆری ئازیزم، ناتوانرێت هیچ شتێک بکرێت، کار لە کار ترازاوە. من پیاوە بچووکەکەی سەر شەقامەکانم و

هەروایش دەمێنمەوە، پیاوێک کە هیچ بیروڕایەکی تایبەت بە خۆم نییە؛ من کێم تا بیروڕای خۆمم هەبێت؟..."

گوێ بگرە، تۆ لە پاڵ ئەفسانەی "پیاوە بچووکەکە"دا خۆت حەشار داوە، چونکە دەترسیت لێشاوی ژیان ڕاتبپێچێت و ناچار ببیت، لەبەر خاتری هیچ نا، لەبەر خاتری منداڵ و نەوەکانت مەلە بکەیت.

لەبەر هەموو شتێک، ئەو شتانەی کە ئیدی نایانکەیت، لەبەر ئەوەیە هەست بەوە دەکەیت کە پیاوێکی بچووکیت، پیاوێک کە هیچ بیروڕایەکی تایبەت بە خۆی نییە و دەڵێت: "من کێم تا بیروڕای خۆمم هەبێت؟..." تۆ خاوەن بیروڕای خۆتیت، لە داهاتوودا نەزانین و نەپاراستن و دەرنەبڕینی بیروڕاکانت بە شەرمێکی گەورە دادەنرێن.

"بەڵام ڕای گشتی سەبارەت بە بیروڕاکانم چی دەڵێت؟ گەر بیروڕاکانم دەرببڕم وەکوو کرمێک لەژێر پێیاندا دەفلیقێمەوە!"

هۆ پیاوی گزگل! ئەوەی تۆ بە "ڕای گشتی" ناوی دەبەیت، کۆکراوەی سەرجەم بیروڕای هەموو پیاوان و ژنە بچووکەکانە. هەموو ژن یان پیاوێکی بچووک بیروبۆچوونی ڕاست و هەڵەیشی هەیە. بیروبۆچوونە هەڵەکانیان دەرئەنجامی ترسیانە لە بیروبۆچوونی هەڵەی پیاوان و ژنانی بچووک، هەر لەبەر ئەمەیشە بیروبۆچوونە ڕاستەکان دەرناکەون. بۆ نموونە، تۆ چیتر

بڕوا بەوە ناکەیت کە "حیسابت بۆ ناکرێت." لە داهاتوودا بەو زانیارییە دەزانیت و پارێزگاریی لێ دەکەیت کە تۆ هەڵگری کۆمەڵگای مرۆڤایەتیت. ڕامەکە هێندە مەترسە، بەرپرسبوون لە کۆمەڵی مرۆڤایەتی هێندە مەترسیدار و ترسناک نییە.

"دەبێت چی بکەم بۆ ئەوەی ببم بە هەڵگری کۆمەڵی مرۆڤایەتی."

پێویست ناکات هیچ شتێکی تایبەت یان نوێ بکەیت، تەنیا لەسەر ئەوەی کە کردووتە، بەردەوام ببە. کێڵگەکانت بکێڵە، چەکوشەکەی دەستت بە کارامەیی بەکار بهێنە، نەخۆشەکانت بپشکنە، منداڵەکانت بۆ خوێندنگا ببە، یان بۆ شوێنی یاریکردن، ڕاپۆرت لەبارەی ڕووداوەکانی ڕۆژەوە بنووسە، قووڵتر بچۆ نێو نهێنییەکانی سروشت و هەموو ئەو شتانەی کە کردووتن. بەڵام تۆ وا هەست دەکەیت ئەم شتانە گرنگ نین، تەنیا ئەوەی مارشاڵ دیکۆراتوس، یان شازادە ئینفلاتوس، یان نمایشی سوارچاکەکان بە زرێپۆشی بریقەدارەوە دەیکەن، جێی گرنگ و بایەخن.

"بەڵام تۆ خەیاڵپڵاویت دکتۆر! ئەی نابینیت مارشاڵ دیکۆراتوس و شازادە ئینفلاتوس سەرباز و چەکەکیان بۆ جەنگ هەیە، بۆ ئەوەی پەلکێشم بکەن و لە جەنگدا خزمەتیان بکەم، بۆ ئەوەی کێڵگەکەم، تاقیگەکەم یان لێکۆڵینەوەکەم تەفروتونا بکەن؟"

بـۆ خزمەتـی جەنـگ پەلکـێش کراویـت و کـێڵگە و کـارگەکەت وێـران کـراون، چـونکە تـۆ هـاوار دەکەیـت: "بـژی،" لە کاتێکـدا وایشـیان بەسـەرتدا هێنـاوە. ئەگەر بە ڕوونـی بتزانیـایە و بە زانیارییەکانت هەستایتایە کە کێڵگە بـۆ بەرهەمهێنـانی گەنـم و کـارگەیش بـۆ دروسـتکردنی کەرەسـتەی ناومـاڵ و پـێڵاوە، نەک چەک، کـارگە و کێڵگەکـان بـۆ ئەوە نیـین کە وێـران بکـرێن، ئەوا شـازادە ئینفلاتـوس، سـوارچاکە کارامەکە، نە سـەربازی دەبـوو نە چەک. مارشاڵ و شازادە ئینفلاتوس ئەمانە نـازانن، چـونکە قەت لە کـێڵگە و کـارگە و تـاقیگەدا کاریـان نەکـردووە؛ بڕوایـان وایە تـۆ کـار دەکەیـت بـۆ پاراسـتنی ئـابڕووی ئەڵمانیـا، یـان بـۆ نیشـتمانی کرێکـاران، نەک بـۆ ئەوەی بژێوی یان جلوبەرگ بۆ منداڵەکانت پەیدا بکەیت.

"ئەی کەواتە چـی بـکەم؟ ڕقـم لە جەنـگە، ژنەکەم کـزۆڵانە دەگـری کاتێـک بـۆ جەنـگ پەلکـێش دەکـرێم، منـداڵەکانم برسـییان دەبێـت کاتێـک سـوپای کرێکـاران خـاکەکەم داگیـردەکەن و، جەنـدەکی مردووەکـان دەگـاتە ملیۆنان. ئەوەی دەمەوێت تەنیا ئەوەیە لە کێڵگەکەمدا کار بکەم و دوای کارکردنیش لەگەڵ منداڵەکانمدا یـاری بکەم و ژنەکەمـم خـۆش بوێـت و ڕۆژانـی یەکشـەممانیش دەمەوێت مۆسیقا لێبدەم و سەمابکەم و گۆرانی بڵێم. چی بکەم؟"

تەنیا لەسەر ئەو کارانە بەردەوام ببە کە بەردەوام کردووتن و ویستوتە بیانکەیت. کار بکە، ڕێ بدە منداڵەکانت خۆشبەختانە گەورە ببن، ژنەکەیشت خۆشبوێت. ئەگەر ئەمانە بە ڕوونی و نەگۆڕییەوە ئەنجام بدەیت، ئەوا هیچ جەنگێک بەرپا نابێت، جەنگێک کە ژنەکەت بخاتە بەر بەزەیی ئەو سەربازانەی نیشتمانی کرێکاران کە تینووی گانن. منداڵە هەتیوەکانت لەسەر شەقامەکان برسی بن و تۆیش بە تەموومژاوییەوە بڕوانیتە "گۆڕەپانی سەربەرزی."

"بەڵام ئەی چی بکەم ئەگەر بۆ کارەکەم و ژنەکەم و منداڵەکانم بژیم، پاشان ئەگەر هەنەکان[1] یان ئەڵمانییەکان یان یابانییەکان یان ڕووسییەکان یان هەر کەسێکی تر بیەوێت وڵاتەکەم داگیربکات؟ ئەی ناچار نابم بەرگری لە نیشتمانەکەم بکەم؟"

تۆ ڕاست دەکەیت، پیاوی بچووک. کاتێک هەنەکانی ئەم یان ئەو نەتەوەیە پەلاماریان دایت، ئەوا دەبێت دەست بدەیتە چەک. بەڵام ئەوەی کە نایبینیت ئەوەیە: "هەنەکان"ی هەموو نەتەوەکان هیچ نین جگە لە ملیۆنان پیاوی بچووک، کە هاوار دەکەن: "با بژی" و بە شان و

[1] هەنەکان: هۆزێکی ڕەوەندی جەنگاوەری ئاسیایی بوون، لە سەدەی ٥مەی زایینیدا بەشێکی زۆری ئەوروپایان داگیر کرد. لێرەدا ئاماژەیە بۆ کەسانی دڕندە و خراپەکار.(هەڵەچن)

باڵی گەورەکانیاندا هەڵدەدەن. شازادە ئینفلاتوس ئەوانە بۆ جەنگ بانگ دەکات کە کار ناکەن، ئەوانەیش وەک تۆ بڕوایان وایە کە هیچ حیسابێکیان بۆ ناکرێت و دەڵێن: "من کێم تا بیروبۆچوونی خۆمم هەبێت؟"



من کێم تا بیروبۆچوونی خۆمم هەبێت؟

هەرکاتێک زانیت کە تۆ کەسێکیت بیروبۆچوونێکی تایبەت بە خۆتت هەیە و کێڵگە و کارگەکەت خزمەت بە ژیان دەکەن نەک مردن، ئەو دەمە دەتوانیت وەڵامی پرسیارەکەی خۆت بدەیتەوە. پێویستت بە هیچ سیاسەتمەدارێک نییە بۆ ئەوە. لەبری ئەوەی بەردەوام بیت لە هاوارکردن و ڕازاندنەوەی گۆڕی "سەربازی ون،" لەبری ئەوەی ڕێ بدەیت شازادە و مارشاڵی گشت کرێکاران هۆشیاریی نەتەوایەتیت بە پێیەکانیان پان بکەنەوە، دەبێت بە "بڕوابەخۆبوون" و "وشیاریی کار"ەوە بەرەنگارییان ببیتەوە(سەربازە ونەکەت زۆر باش دەناسم، پیاوی بچووک. سەربازە ونەکەتم ئەو کاتە ناسی کە لە چیاکانی ئیتاڵیا دەجەنگام، ئەویش وەک تۆ پیاوێکی بچووکە، بڕوای وا بوو کە هیچ بیروبۆچوونێکی تایبەت بە خۆیی نییە، دەیوت: "من کێم تا بیروبۆچوونی خۆمم هەبێت؟...") دەتوانیت برا بچووکەکەت لە یابان ، لە چین لە هەر وڵاتێکی هەنەکان بناسیت و، دەتوانیت ڕێگەی بدەیت بیروبۆچوونە ڕاستەکانت سەبارەت بە کارەکانت بزانێت، وەکوو کرێکار، پزیشک، جوتیار، باوک یان مێرد و، بۆ ئەوەی دواجار قایلی بکات هەموو ئەوەی پێویستە بیکات، ئەوەیە هەرچییەک دەبێتە مایەی هەڵگیرسانی جەنگ، ئەستەم ببێت تا بە کار و خۆشەویستییەکەیەوە پەیوەست ببێت.

"زۆر باشە، بەڵام ئەوان ئێستا بۆمبی ئەتۆمییان هەیە و، هەر یەکێک لەو بۆمبانە بەسە بۆ کوشتنی هەزاران هەزار کەس!"

پیاوی بچووک! هێشتا بە دروستی بیرناکەیتەوە. لەو بڕوایەدایت شازادە ئینفلاتوسی سوارچاک بە زرێپۆشی بریقەدارەوە بۆمبی ئەتۆمی دروست دەکات؟ نەخێر، دیسانەوە تەنیا پیاوە بچووکەکان بۆمبی ئەتۆمی دروست دەکەن، ئەوانەی کە هاوار دەکەن: "بژی،" لەبری ئەوەی دەست لە دروستکردنی بۆمبی ئەتۆمی هەڵبگرن. پیاوی بچووک! دەبینیت هەمیشە باسەکە دەگەڕێتەوە سەر تۆ و بیرکردنەوەکانت، جا ڕاست بن یان هەڵە. ئەگەر تۆ، ئەی گەورەترین زانای سەدەی بیستەم، هێندە بچووک نەبوویتایە، ئەوا لەبری هۆشیاریی نەتەوەیی، پەرەت بە هۆشیاریی دونیایی دەدا و، کەرەستەیەکت دەدۆزییەوە بۆ ڕێگەگرتن لە هێنانی بۆمبی ئەتۆمی بۆ نێو ئەم دنیایە، یان ئەگەر ئەم کارە ئەستەم بووایە، ئەوا بە ڕوونی کاریگەریی خۆتت بۆ ڕێگەگرتن لە بەکارهێنانی بەکار دەهێنا. سەرسووڕماویت لە داهێنانەکەت و ڕێگایەک نادۆزیتەوە بۆ دەربازبوون، چونکە بەدوای ڕێگەی هەڵەدا دەگەڕێیت و هەڵە بیردەکەیتەوە، بەڵام بەڵێنت بە هەموو پیاوە بچووکەکان داوە کە وزەی ئەتۆمی چارەسەری نەخۆشیی شێرپەنجە و ڕۆماتیزمەکانیان دەکات. لە کاتێکدا بە ڕوونی دەیزانیت کە ئەم وزەیە هەرگیز بۆ

چارەسەرکردن بەکار نایەت و، چەکێکی کوشندەت دروستکرد و هیچی تر. بەمەیش کەوتیتە هەمان بنبەستەوە کە "فیزیا"کەت تیایدا گیری خواردبوو، بۆ هەتاهەتایە کۆتاییت پێ هاتووە. دەزانیت پیاوی گرگن! من ئەگەرەکانی چارەسەرکردن بەو وزەی گەردوونییەی دۆزیومەتەوە، پێشکەشی تۆم کردوون، بەڵام تۆ بەرانبەری بێدەنگ بوویت. بەردەوام بە مردن بە شێرپەنجە و دڵۆەستان دەمریت و لەگەڵیدا هاوار دەکەیت: "بژی، نەمری بۆ کلتوور و تەکنیک!" پیاوی بچووک! بەڵام با پێت بڵێم: تۆ بە چاوکراوەیی گۆڕی خۆتت هەڵکەندووە. بڕوات وایە سەردەمێکی نوێ دەستی پێکردووە، "سەردەمی وزەی ئەتۆمی." ئەوە سەردەمە گەیشتووە، بەڵام نەک بەو شێوەیەی کە تۆ بیری لێ دەکەیتەوە. لە دۆزەخەکەی تۆوە دەستی پێنەکردووە، بەڵکو لە تاقیگە بێدەنگەکەی منەوە لە سوچێکی دوورە دەستی ئەمریکاوە دەستی پێکردووە.

پیاوی بچووک! بە تەواوی دەکەویتە سەر خۆت، کە ئاخۆ بۆ جەنگ دەچیت یان ناچیت؟ ئەگەر ئەوەت بزانیایە کە تۆ بۆ ژیان کار دەکەیت نەک مردن، ئەگەر ئەوەت بزانیایە کە هەموو پیاوە بچووکەکانی دونیا کتومت وەک تۆن، بە تایبەتمەندییە باش و خراپەکانیانەوە.

درەنگ یان زوو—هەمووی لەسەر خۆت بەندە—چیتر هاتوهاوار ناکەیت، چیتر کێڵگەکانت بۆ وێرانکردنی

گەنم بەکار ناهێنیت، یان کارگەکەت ببێت بە ئامانجی تفەنگەکان. درەنگ یا زووت کەوتووە، چیتر ئاوات بەوە ناخوازیت کە بۆ مردن کار بکەیت، بەڵکو تەنیا بۆ ژیان کاردەکەیت.

"ئەی داوای مانگرتنی گشتی بکەم؟"

نازانم ئاخۆ دەبێت ئەوە بکەیت یان شتێکی تر. مانگرتنە گشتییەکەت ئامرازێکی خراپە، چونکە بەوە خۆت تووشی گلەییی ئەوە دەبیتەوە کە وا دەکەیت ژن ومنداڵەکان تووشی برسێتی بکەیت. لە مانگرتندا بەرپرسیارێتیی مەزنیی خۆت ناسەلمێنیت، کە ئاخۆ ئاسوودەیی یان خەفەتت بۆ کۆمەڵگاکەت دەوێت. کاتێک کە مان دەگریت، کار ناکەیت، بەڵام ڕۆژێک دێت بۆ ژیان کار دەکەیت؛ نەک بۆ مانگرتن. ئەگەر دەتەوێت مان بگریت، ئەوا ناوی بنێ: "مانگرتن لە کار،" بە کارکردن بۆ خۆت، بۆ منداڵەکانت، بۆ ژنەکەت یان دەستگیرانەکەت، بۆ کۆمەڵگاکەت، بۆ ئەو بەرهەمەی کە بەرهەمت هێناوە، یان بۆ کێڵگەکەت مان بگرە. پێیان بڵێ کە تۆ کاتت نییە بۆ شەڕەکانی ئەوان و کاری گرنگتر هەیە تا ئەنجامیان بدەیت. پەرژینێک بە دەوری هەموو شارێکی ئەم دونیایەدا دروست بکە، لێبگەڕێ سیاسەتمەدار و مارشاڵەکان یەکتری لەناو ببەن. هەی پیاوی بچووک! ئەمە دروستترین کارە کە دەبێت بیکەیت، ئەگەر دەست لە

هاتوهاوار هەڵبگریت و، چیتر بڕوات وا نەبێت کە تۆ هیچ نیت و هیچ بیروڕایەکی تایبەت بە خۆتت نییە.

هەموو شتێک لەنێو دەستی تۆدایە، ژیانت، ژیانی منداڵەکانت چەکوشەکە و بیستۆکی پزیشکەکەت. دەزانم کە سەر دەلەقێنیت، پێتوایە یۆتۆپیاییم، یان تەنانەت"سوور"م. پیاوی بچووک! دەپرسیت: چ کاتێک ژیانت باش و سەلامەت دەبێت؟ وەڵامی ئەم پرسیارەت نامۆیە بە شێوازی بوونت:

ژیانت باش و پارێزراو دەبێت، کاتێک بەلای تۆوە "ژیان" لە "ئاساییش"مانای زیاتر بێت؛ "خۆشەویستی" لە "پارە" گرنگتر دەبێت؛ "ئازادی"ت لە "هێڵی حیزبەکەت" یان "بۆچوونی گشتی" گرنگتر بێت؛ کاتێک خوو و ڕەوتی بتهۆڤن یان باخ دەبێت بە خوو و ڕەوتی تەواوی بوونت(پیاوی بچووک، ئەو خوو و ڕەوتە لە تۆدا هەیە، لە سوچێکی قووڵی بوونتدا لە گۆڕت ناوە؛) کاتێک بیرکردنەوەت لەگەڵ هەستەکانتدا هەماهەنگ دەبێت و چیتر جیاواز نابێت؛ کاتێک بتوانیت لە کاتی خۆیدا لە کارامەیی و لێهاتوویيت تێبگەیت و لە کاتی خۆیدا دان بە پیربوونتدا بنێیت؛ کاتێک لەگەڵ هزری پیاوە مەزنەکاندا دەژیت، نەک لەگەڵ تاوانی جەنگاوەرە مەزنەکاندا؛ کاتێک مووچەی مامۆستای منداڵەکانت باشتر بێت لە مووچەی سیاسییەکانت؛ کاتێک زیاتر لە مۆڵەتی هاوسەرگیری، ڕێز لە خۆشەویستیی نێوان ژن و پیاوێک دەگریت؛ کاتێک

لەکـاتی خۆیـدا دان بە هەڵەکـانی بیرکردنەوەتـدا دەنێیـت، نەک درەنگتـر وەک ئەمـڕۆ؛ کاتێـک بە بیسـتنی ڕاسـتەقینە هەست بە سەربڵندی بکەیت و، بە بیسـتنی کێشـە باوەکان هەسـت بە تـرس بکەیـت؛ کاتێـک ڕاسـتەوخۆ چـاوت بە هـــاوڕێ کرێکارەکانـــت دەکەوێـــت، نەک لە ڕێـــی سیاســـەتمەدارەکانتەوە؛ کاتێـــک دڵخۆشـــیی کـــچە هەرزەکارەکەت لە خۆشەویستیدا شادیت پێ دەبەخشێت، لەبـری ئەوەی تـووڕەت بکـات؛ کاتێـک سـەرت لەوە بـا دەدەیت کە کەسێک منداڵێکی بچـووکی سـزاداوە لەسـەر ئەوەی دەستی بۆ نـاوگەڵی بـردووە؛ کاتێک ڕووخسـاری مرۆڤەکـان لەســەر شــەقامەکان ئـازادی و زینـدوویی و خۆشیان پێوە دیارە، نەک خەمگینی و بەدبەختی؛ کاتێک ئیـــدی خەڵکـــی بە ســـمتی ڕەق و ئەنـــدامی سێکســـیی مردووەوە بەسەر ئەم زەوییەدا ڕێ ناکەن.

پیاوی بچووک! تۆ ئامۆژگاری و ڕێنوێنی دەخوازیت. بە درێژاییـی هەزاران سـاڵ تـۆ ئامۆژگـاری و ڕێنوێنیـت هەبـووە، چ بە بـاش یـان خـراپ. هۆکـاری مـانەوەت لەو بەدبەختییەدا ئەوە نییە کە بـاش ئامۆژگـاری نەکراویـت، بەڵکـو لەبەر بچـووکی و بێنرخیـی خـۆت بـووە. دەتـوانم ئامۆژگـاریی باشـت بـکەم، بەڵام بەو شـێوەیەی کە ئێسـتا بیـر دەکەیـتەوە، ناتوانیـت بەگـوێم بکەیـت و جێبەجێـی بکەیت.

گریمــان ئامۆژگــاریی ئەوەم کردیــت کە دەســت لە هەمــوو دیبلۆماســییەکان هەڵبگریــت و بیــانگۆڕیتەوە بە کارامەیی و برایەتی و دۆستایەتی لەگەڵ هەموو پینەدۆز و دارتاش و میکانیکی و تەکنیکار و پزیشک و مامۆستا و نووســەر و کــارگێڕ و کرێکــار و جوتیــارانی ئینگلــتەرا، ئەڵمانیــا، ڕووســیا، ئەمێریکــا، ئەرجەنتــین، بەڕازیــل، فەلەستین، ولاتانی عەرەبی، تورکیا، ئەسکەندەناڤیا، بانی تبت، ئیندۆنیزیا، لێبگەڕێیت هەموو پینەدۆزانی دونیا بڕیار بدەن باشترین ڕێگا هەڵبژێرن لە پێشکەشکردنی پێڵاو بە گشت منداڵانی چین؛ لێبگەڕێیت کرێکارانی کانەکان خۆیان ڕێگەچارەیەک بدۆزنەوە کە چۆن خەڵکی لە سەرماوسۆڵە بپــارێزن؛ لێبگەڕێیــت مامۆســتایانی هەمــوو ولات و نەتەوەکــان خۆیــان ڕێگەچــارەیەک بــدۆزنەوە کە چــۆن منـداڵانی تـازەلەدایکبوو لە درەنـگ کـاژێربوون/زاوێربوون و نەخۆشـییە مێشـکییەکان بپـارێزن... هتـد. چـی دەکەیـت، پیاوی بچـووک، ئەگەر لە ژیـانی مرۆڤەکانـدا ڕووبەڕووی ئەو ڕاستییە حاشاهەڵنەگرانە بوویتەوە؟

بە دڵنیاییەوە خۆت یان لە ڕێگەی هەندێک لە نوێرانی حیزبەکەت، کڵێساکەت، حکومەت یـان یەکێتییەکەتەوە( تـا وەکوو "سوور"ێک زیندانیم دەکەیت،) پێم دەڵێیت:

مـن کێم تـا پەیوەنـدییە دیبلۆماسـییە نێودەوڵەتییەکـان بە پەیوەنــدیی نێــودەوڵەتیی کــار، یــان دەســتکەوتە کۆمەڵایەتییەکان بگۆڕمەوە؟"

یان: "ئێمە ناتوانین ئەو جیاوازییانە بسڕینەوە کە لە پەرەسەندن و بەرەوپێشچوونی ئابووری و فەرهەنگدا هەن."

یان: "ئایا تۆ دەتەوێت پەیوەندی لەگەڵ ئەڵمانییە ڕەگەزپەرست و یابانییەکان و کۆمۆنیستە ڕووسییەکان و سەرمایەدارە ئەمریکاییەکاندا ببەستین؟"

یان: "بەر لە هەموو شتێک وازم لە ڕووسیا، ئەڵمانیا، ئەمێریکا، ئینگلتەرا، جوولەکە یان عەرەبستانەکەمە."

یان: "هێندە کارم هەیە بۆ ئەوەی ژیانی خۆم بخەمە ژێر ڕکێفی خۆمەوە و یەکێتی بەرگدرووانی وڵاتەکەمدا بە باشی هەڵبکەم، با کەسێکی دی گرنگی بە کاروباری بەرگدرووانی وڵاتانی تر بدات."

یان: "گوێ بۆ ئەو سەرمایەدارە، ئەو بەلشەفیکە، ئەو فاشیستە، ئەو ترۆتسکییە، ئەو ئینتەرناسیۆنالە، ئەو جوولەکەیە، ئەو بێگانەیە، ئەو ڕۆشنبیرە، ئەو خەوبینە، ئەو یۆتۆپیاییە، ئەو دیماگۆگە، ئەو پیاوە شێتە، ئەو تاکرەوە، ئەو ئاژاوەچییە، مەگرە. ئایا تۆ هیچ هۆشیارییەکی ئەمێریکایی، ڕووسیایی، ئەڵمانیایی، ئینگلتەرایی، جوولەکەییت نییە؟"

زۆر بە دڵنیاییەوە یەکێک لەو دروشمانەت بەکار دەهێنا بۆ خۆدزینەوە لەو بەرپرسیارێتییەی بۆ پەیوەندیی مرۆڤەکان لەسەر شانتە.

"ئایا من هیچ نیم؟ تۆ دان بەوەدا نانێیت کە هیچ تایبەتمەندییەکی باش لە مندا هەبێت! لەگەڵ ئەوەی کە کار دەکەم بۆ ئەوەی ژیان بۆ ژنەکەم و منداڵەکانم دابین بکەم، ژیانێکی باش دەژیم و خزمەتی وڵاتەکەم دەکەم، ناکرێت هێندە خراپ بم!"

دەزانم تۆ مرۆڤێکی باش و چالاکیت، وەکوو هەنگ یان مێرووولە. ئەوەی من کردم تەنیا ئاشکراکردنی پیاوە بچووکەکەی ناختە کە ژیانتی وێران کردووە و، هەزاران ساڵە وای لێ کردووە. پیاوی بچووک! تۆ گەورەیت لە کاتێکدا بچکۆلە نییت. تۆ گەورەیت کاتێک کارەکەت بە خۆشەویستییەوە لەئەستۆ دەگریت و ئەنجامی دەدەیت، کاتێک چێژ لە نەخشاندن و بیناکردن و وێنەکێشان و ڕازاندنەوە و چاندن وەردەگریت، کاتێک چێژ لە دیمەنی ئاسمانی شین و ئاسک و شەونم و میوزیک و سەماکردن و بینینی منداڵە گەورەبووەکانت و جەستەی جوانی ژنەکەت/پیاوەکەت وەردەگریت؛ کاتێک بۆ تێگەیشتن لە ئاسمان لە ئەستێرەکان دەڕوانیت، یان دەچیت بۆ کتێبخانە بۆ ئەوەی ئەوە بخوێنیتەوە کە ژنان و پیاوانی تر چۆن بیر لە ژیان دەکەنەوە. تۆ گەورەیت کاتێک، وەک باپیرەیەک، نەوەکەت لە باوەش دەگریت و کاتەکانی ڕابردووی بۆ دەگێڕیتەوە، کاتێک لە لاپرەسەنییە منداڵانە متمانەپێکراوەکەیەوە سەیری داهاتوویەکی ناڕوون دەکەیت. گەورەیت وەکوو دایکێک کاتێک لایلایە بۆ منداڵە

تـــازەلەدایكبووەكەت دەكەیـــت تـــا خەوی لێبكەوێـــت، بە چـاوانی پــڕ لە فرمێســكەوە لە كـانگەی دڵــتەوە ئـاواتی داهـاتوویەكی خۆشـی بـۆ دەخوازیـت، كاتێـك، بە درێژایـی هەموو ساتەكانی ساڵ، داهاتووی تێدا بنیاد دەنێیت.



ئايا من هيچ نيم؟

پیاوی بچووک! تۆ گەورەیت، کاتێک گۆرانییە فۆلکلۆرییە چاکەکان دەڵێیت، یان کاتێک بە هەمان ئاوازی ئۆکۆردیۆنەکە سەما دەکەیت، چونکە گۆرانییە فۆلکلۆرییەکان پڕ چێژ و ئازارکوژن، لە تەواوی دونیادا وەکوو یەکن. تۆ گەورەیت کاتێک بە هاوڕێکەت دەڵێیت:

"سوپاسی ئەو چارەنووسە باشە دەکەم کە پێم دراوە، بۆ ئەوەی ژیانێکی دوور لە پیس و پۆخڵی و چڵێسی بژیم و گەورەبوونی منداڵەکانم لە گڕوگاڵکردن و خۆخشاندن و پێگرتن و یاریکردن و پرسیارکردن و پێکەنین و خۆشەویستی ببینم؛ تەواوی هەستەکانم بۆ بەهار و شنەباکەی و خوڕەی ئەو چەمەی کە بەلای ماڵەکەمدا تێپەڕ دەبێت و ئاوازی باڵندەکانی نێو دارستان بپارێزم؛ بۆ ئەوەی بەشدار نەبووم لە قسەهێنان و بردنی دراوسێ بەدکارەکانم؛ بۆ ئەوەی دڵخۆش بووم بە لەئامێزگرتنی هاوڕێکەم و توانیی هەست بە تەوژمی ژیان لە جەستەمدا بکات؛ لە کاتی بێهیواییدا هەستەکانم لەدەست نەدا و، بەمەیش ژیانم مانایەکی هەبوو. چونکە هەمیشە گوێم لە دەنگی ناخم گرتووە کە وتویەتی: 'تەنیا یەک شت هەیە جێی بایەخ بێت: ژیانێکی باش و خۆشبەختانە بژی. شوێن دەنگی دڵت بکەوە، تەنانەت ئەگەر لە ڕێی ڕۆحە ترساوەکان لای دایت. ڕەق و دڵپڕ مەبە، ئەگەرچی ژیان هەندێک جار ئەشکەنجە و ئازارت دەدات.' لە بێدەنگیی شەوێکدا، کە کاری ڕۆژانە تەواو

دەبێت، کاتێک لە باخچەی بەردەم ماڵەکەمدا لەگەڵ ژن یان منداڵەکەم دادەنیشم و هەست بە هەناسەکانی سروشت دەکەم، گوێم لە ئاوازێک دەبێت، ئاوازێک سەبارەت بە داهاتوو: 'ئۆی، ئەی ملیۆنان خەڵک، لە ئامێزتان دەگرم و پڕ بەم دونیایە ماچتان دەکەم.' لە ناخەوە هیوای ئەوە دەخوازم کە ئەم ژیانە فێری ئەوە ببێت سوور بیت لەسەر مافەکانی، بۆ ئەوەی سەرسەختی و ڕۆحە شەرمنەکان بگۆڕێت، ئەوانەی کە وا دەکەن بۆمباکان بتەقێن. ئەوان بۆیە وا دەکەن تا ژیان لێیان هەڵبێت. کوڕە بچووکەکەم لە باوەش دەگرم کاتێک لێم دەپرسێت: 'باوکە، خۆر ئاوابوو. بۆ کوێ چوو؟ ئایا بەم زووانە دەگەڕێتەوە؟" منیش پێی دەڵێم: 'بەڵێ کوڕم، زوو دەگەڕێتەوە تا گەرممان بکاتەوە.' "

***

پیاوی بچووک! گەیشتمە کۆتایی قسەکانم بۆ تۆ. زیاتر هەیە کە پێتی بڵێم، بەڵام ئەگەر ئەم وتانەمت بە وریایی و بە دڵسۆزییەوە خوێندبێتنەوە، ئەوا پیاوە بچووکەکەی ناخت دەدۆزیتەوە، تەنانەت لەو شوێنانەیش کە پیشانم نەداویت، چونکە هەمیشە هەمان سروشتە کە بیرکردنەوە و کردارە بچووکەکانت بڵاو دەکاتەوە.

هەرچییەک کە بەرانبەر بە من کردووتە، یان لە داهاتوودا بەرانبەرم دەیکەیت، ئەگەرچی سەربەرزم دەکەیت و بە بلیمەت ناوم دەبەیت، یان دەمخەیتە یەکێک لەو شوێنانەی کە بۆ نەخۆشییە مێشکییەکانن، ئەگەرچی وەک ڕزگارکەرێک ڕێزی زۆرم لێ دەگریت، یان وەک شۆفارێک هەڵمدەواسیت، درەنگ بێت یان زوو پێداویستی ناچارت دەکات لەوە تێبگەیت کە من یاسای ژیانم دۆزیوەتەوە و ئەو کەرەستەیەم پێ بەخشیویت تا هۆشیارانە ژیانتی پێوە بەڕێوە ببەیت، وەک ئەوەی تا ئێستا توانیوتە ئامێرەکان بەڕێوە ببەیت. من ئەندازیارێکی ئەمەکداری زیندەوەرەکانت بووم، نەوەکانت شوێنپێی من هەڵدەگرن و دەبن بە ئەندازیارێکی باشی سروشتی مرۆڤەکان. من بوارە مەزنە بەرفراوانەکەی ژیانم لەسەر سروشتی گەردوون لە تۆدا ئاشکرا کردووە و ئەمەش گەورەترین خەڵاتی منە کە پێم درابێت.

دیکتاتۆرەکان و ستەمکارەکان و زۆردارەکان، فێڵبازەکان و ژەهراوییەکان و سیسرک و کەمتیارەکان،

بەدەست ئەو شتەوە دەناڵێنن کە بیرمەندێکی پیر پێشبینی کردووە:

**لەم دنیادا**

**ئەمن تۆوی وشە پیرۆزەکانم ناشت،**

**گەر وا نەبا، زۆر لەمێژ بوو دارخورماکان وشک بووبوون،**

**گابەردەکانیش ورد بووبوون؛**

**گەر وا نەبا، زۆر لەمێژ بوو کە پاشا درەوشاوەکان**

**بەدەم باوە وەک گەڵای وەریو فڕیبوون:**

**لەنێو هەموو لافاوێکدا هەزاران گەمیەی وەک هی نووح**

**هەڵدەگرن ئەم وتەیەی من:**

**هەر لەبۆ منە سەرکەوتن!**

# فەرهەنگۆك

**تێبینی:** تەواوی ئەو وشە کوردییە پەتییانەی لەم کتێبەدا هاتوون، هەڵچن لەنێو وەرگێڕدراوەکەدا بۆ ئەو وشانەی گۆڕیون و فەرهەنگۆکی بۆ دروست کردوون.

**ئـ**

**ئائل:** ستەمکار و چەوسێنەر

**ئاخێزدان:** جووڵەیەکی کەمە وەک تەکانێک وایە

**ئاز:** سەرڕاست و بێفێڵ و درۆ

**ئامبازبوون:** یەکدی گووشین لە باوەشدا و دەستلەملانبوون.

**ئامیان:** هەوێن

**ئاوەزپەسەند:** عقلاني

**ئۆل:** ئایین

**ئۆین:** فێڵ

**ئۆینبازی:** تەڵەکەبازی، فێڵبازی

**ب**

**ببڕای:** هەرگیز

**بۆدڕن:** بۆنی ناخۆشی لەش

**بە پارێزەوە:** بە حەزەرەوە

**پ**

**پاتە:** بارە(دووپات: دووبارە، سێپات: سێبارە)

**پاژ:** بەش، پارە

**ت**

**تاراندن:**بۆ هەمیشە دەرکردن

**تخووب:** سنوور، کەوشەن

**تۆرەمە:** زاتۆرە، نەوە و بنەچە

**تۆلازی:** حەزکردن لە ژنان،

شەهوەتلەوەڕێنی
**تەپکە:** تەڵە، داو
**تەکووز:** ڕێکوپێک و بەتەرتیب
**تیز:** گاڵتەکردن
**تیزخەند:** ڕابواردن بە کەسێک بۆ ئەوەی خەڵک پێی پێبکەنن.

**ج**
**جندەخانە:** قەحبەخانە
**جوجە:** جۆرە قۆلانچەیەکی بچووکی سوورە، خوێن دەمژێت و، بە مرۆڤدا هەڵبگەڕێت، لیر دەکات.
**جەندەک:** تەرم

**خ**
**خاپاندن:** فریودان، هەڵخەڵەتاندن
**خاپێنراو:** فریودراو، هەڵخەڵەتێنراو
**خاکەڕایی:** بێفیزی

**د**
**درم:** تەشەنەکردوو، گوازراوە
**دڕدۆنگی:** دوودڵی
**دژ:** قەڵا
**دڵچەرێن:** خۆشگوزەران و تۆڵاز

**ڕ**
**ڕاساڵی:** سەرڕاستی
**ڕامووسان:** ماچکردن بە ئەوینەوە
**ڕەشەمەرگ:** تاعوون، چاوەقووڵکە، بامرێ
**ڕێنوێن:** ڕێپیشاندەر
**ڕیپاڵ:** ڕینگاڵ، جلی کۆنە و دڕاو

**ز**
**زاوێر:** ڕەحەتبوونی ژن لە گان
**زەڤێر:** فاززکی، ئارەزووی سێکسکردن
**زەنەک:** کەسێ زۆر سێکس بکات
**زەنەکانە:** حەزی زۆر بۆ سێکس کردن

## ژ

**ژنکۆک**: ژنی گەمژە و ناتەواو

## س

**ساوێر**: وەهم

**سەنێر**: شیاکە

## ش

**شلەماسی**: Jelly-fish، جەلییەماسی

**شۆفار**: جاسووس

**شەپڵە**: نەخۆشیی ئیفلیجی

## ف

**فارزکی**: زەڤێر، شەهوەتی سێکس

**فیسقل**: وشەیەکە بۆ سووک و کەمبایەخکردن و بچووک پیشاندانی شتێک بەکار دێت.

## ڤ

**ڤڕ**: بوختان، درۆی هەڵبەستراو، درۆوەپاڵدان

## ق

**قەتارە**: ڕیز

**قەوینتی**: وەسێت

## ك

**کاژێر**: ڕەحەتبوونی پیاو لە سێکس.

**کوڵەبنە**: کورتەباڵا، گرگن

**کەوی**: دەستەمۆ، ماڵیکراو

## گ

**گزگل**: گرگن، کورتەبنە

**گوزەرنامە**: پاسپۆرت

**گولانە**: بچووک

**گەپجاڕ**: ئەو کەسەی گاڵتە بە خەڵکی دەکات و تیزیان پێوە دەنێت.

## ل

**لاپرەسەن**: خۆهەڵقورتێن، فزوول

**لیپاولیپ**: پڕ، تەژی

## م

**ماشینەوە:** کۆکردنەوەی شتی پرش و بڵاو

**ماک:** بنچینە، ڕەسەن، أصل

**ماڵبات:** خێزان، بنەماڵە

**مشکەخۆرە:** گیانەوەرێکە لە جۆری مەمکدارەکان و لە دەشتتدا دەژی، بە ئینگلیزی پێی دەوترێت: Weasel.

**ملەجیڕێ:** ئینکاری

**مەتەرێز:** سەنگەر، خەڵ، چەپەر

**میرغەزەب:** جەللاد، کاربەدەستی حوکوومەت بۆ چەوساندنەوەی خەڵک.

**مینا:** وەکوو، وەک، چاوا، چوون

**مێردەک:** بۆرەپیاو، پیاوی بچووک

## ن

**نەخاسمە:** تەنانەت

## و

**وازلێبوون:** پێخۆشبوون، ئارەزوولێبوون.

**وردبینەزیندەوەر:** Microorganism، ئەو زیندەوەرانەی بە وردبین دەبینرێن.

## ه

**هەتەر:** جددی

**هەڤۆت:** فێرکاری، تعلیم

**هەڵاواردن:** جیاکردنەوە، استثناء

**هەڵاوێرم:** جیا بکەمەوە

**هەڵەداوان:** ڕاکردن و هەناسەسواری

**هەنگینێ:** هەنگین، هەنگێ، پاشان، دواتر

**هێدمان:** متحير